ناوی کتێب بەکوردی: ئائەمەیە ئیسلام
نوسینـــــــی: موحەممەد قوتب
وەرگێڕانـــــــی: مزەفەر عەولا قەسرێی
بڵاوکردنــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی نـاوەوە: جمعە صدیق کاکە
خـــــــــە ت: نەوزاد کۆیی
بـــــــەرگ : أمین مخلص
نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تـــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٦٣٢ ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرێنی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونە تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانە هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیرو بۆچوونەکانیان بین .

بادەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

**پێشکەشە:**

**بەهەموو ئەو کەسانەی، کە دەیانەوێ ئیسلام وەکو خۆی بناسن و، وەکو خۆی جێبەجێی دەکەن و، دەیانەوێ ئیسلام بەرنامەی مرۆڤایەتی بێت و، حوکمی خوا لەسەر زەویدا پەیڕەو بکرێت.**

**وەرگێڕ**

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

کاتێک بانگخوازە ئیسلامیەکان بانگەوازی ئەوە دەکەن، کە تەنها ئیسلام چارەسەرە، زۆر کەس گومانیان لا دروست دەبێت!هەرچی عەلمانیەکان و هاوشێوەکانیانن، مەبەستیان ڕوون و ئاشکرایە، چونکە ئەوان ڕقیان لە ئیسلامەو نایانەوێت هەرگیز ئیسلام ببێتە ڕێگای چاکسازی، حەز ناکەن هیچ کەس بانگەوازی بۆ بکات!چونکە ئایین لەڕوانگەی تێڕوانینی ئەوانەوە، ناکرێ لەگەڵ هیچ کاروبارێکی ژیاندا تێکەڵ بێت و، تەنها بۆ ئەو کەسەی کە ئایینی دەوێت پەیوەندییەك بێت، لەنێوان بەندەوپەروەردگاردا و، ئەم پەیوەندییەش تەنها لەدڵدا بێت و هیچ پەیوەندی بە واقیعی ژیانەوە نەبێت، هەروەها لایان وایە، کە ئایین لەکاروباری ژیاندا، گەندەڵی هەرە گەورەیە، کە خراپەکارییەکانی تر لەمەوە سەرچاوە دەگرن!ئەو جۆرە کەسانە هەڵوێستیان دیارو ئاشکرایەو، هۆکارەکەشی ڕوونە، چونکە ئەوان هەر لە زووەوە بڕیاریان داوە، کە لەهەموو کردارو گوفتارێکدا دوای ڕۆژئاوا بکەون، لەسەر بنەمای ئەوەی، کە ڕۆژئاوا شارستانیەت و پێشکەوتنەو هەر ئەو شایەنی شوێنکەوتنە. ڕۆژئاوا گوتویەتی کە ئایین لەمێژووی ئەودا سەرچاوەی دواکەوتن و، تاریکی بوو . هەروەها پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەدی، تا ئەو کاتەی وازی لە ئایین هێنا، یاخوود بەلایەنی کەمەوە، تا ئەوکاتەی سنوورێکی بۆ داناو گۆشەگیری کرد بەجۆرێك، کە نابێت لێی بێتە دەرەوە، ئیتر ئایین بۆ ئەو

کەسەی کەدەیویست بووە پەیوەندیەك لەنێوان بەندەوپەروەردگاردا و، تەنها لەناو دڵداو پەیوەندی بە واقیعی ژیانەوە نەما.

ئێمە لەم کتێبەدا مشت و مڕو دەمە تەقێ لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا ناکەین، چونکە مشت و مڕ لەگەڵ ئەماندا سوودێك ناگەیەنێت، سەرەڕای ئەوەی، کە لەخوای پەروەردگار داواکارین، بەرەو حەق هیدایەتیان بدات و، بەو چاوانەی، کە پەروەردگار بۆ بینین پێی بەخشیون، بڕوانن، نەك بەچاوی کەسانی ترەوە بڕوانن، ئیتر کوێر و سەر لێ شێواو بن و، ڕێگایان لێ وون بێت.

ئێمە لەم کتێبەدا لەگەڵ کەسانی تردا دەدوێین، ئەوانەی کە لەوانەیە لەدوژمنانی ئیسلامیش نەبن، لەوانەیە پێشیان ناخۆش نەبێت، کە ئیسلام لەسەر زەویدا فەرمانڕەوا بێت، بەڵام لەناو دڵیاندا گومانی ئەوەیان هەیە، کە ئیسلام بە کردار بتوانێت کێشە نوێیەکانی ژیان چارەسەر بکات، ئەو گرفتانەی، کە زۆر ئاڵۆزن و بەردەوام ئاڵۆزتر دەبن و، لەنێوان ژیانی ئەمڕۆ و، ژیانی سەرەتای هاتنی ئیسلام، کە هەموو گرفتەکانی چارەسەر کردن و، بەرەو بەرزترین ئاستی نموونەیی برد، جیاوازییەکی گەورە هەیە، بەجۆرێك کە لەتێڕوانینی ئەواندا کارێکی قورسە وا بیر بکرێتەوە، کە هەمان ئەو چارەسەرانەی، کە ئەو کاتە توانییان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنن و، کێشەکان چارەسەر بکەن، شیاو بن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەم واقیعە ئاڵۆز و تێکەڵو پێکەڵەی ئەمڕۆ تیایدا دەژین.

ئەم جۆرە کەسانە —سەرەڕای ئەوەی مەبەستیان باشەو، دوژمنایەتی ئیسلام ناکەن و، ڕقیان لێی نیە هۆکاری گومانەکەیان ـ چ دەری خەن، یان بیشارنەوە ـ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە ئەوان تەنها سەیری ئەو وێنەیەی

ئیسلام دەكەن، كە لەلایەن نـەوەكانی موسـولْمانانی سـەردەمە كۆتاییـەكان درووست بـووە، ئـیتر وادەزانـن، كـە بـێ توانایـە لـە چارەسـەركردنی تـەنها كێشەیەكیش لە كێشـەكانی ئـەمڕۆمان و، وابـیر دەكەنـەوە، كـە بـارودۆخی ئەمڕۆمان ـبە هەموو ئالْۆزییەكانیەوەـزۆر فـراوانترە لـەوەی، كـە ئیـسلام بتوانێـت كێشـەكانی چارەسـەر بكـات، لایـان وایـە بۆئـەوەی پارێزگـاری لێبكـەین، پێویسـتە لێـرەو لـەوێ بـۆی زیـاد بكـەین، تـا بتوانێـت ئـەم بارودۆخــە وەكــو خــۆی وەربگرێــت، پاشــان هــەولْی چارەســەركردنی كێشەكانی بدات!

لەشــوێنی تــریش ئەمـــەمان بـــاس كـــردووەو، لێرەشـــدا دووبـــارەی دەكەینـەوە، كـە ئـەو ئیسـلامەی ئێمـە بانگـەوازی بـۆ دەكـەین و، دەلْـێین چارەســەرە، ئــەو ئیســلامەیە كــە پــەروەردگار لــە كتێبەكــەی(قورئــان)و، فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتووە، نەوەك بەو جۆرەی، كە نـەوەكان پـەیڕەویان كـردووەو، لێیـان لاداوە، چـونكە ئیسـلام بـەوجۆرەی كـە خـوا ناردوویەتیە خوارێ، بەلْگەو بیانووە بەسەر ئوممەتدا و، ئوممەت‌لە هـیچ كاتێكـــدا بەلْگـــە نیـــە بەســـەر ئیســـلامدا، بەتایبـــەتی ئـــەو نەوانـــەی سەردەمەكانی كۆتایی، كە وردە وردە لە ڕاستی ئیسلام دووردەكەونەوە، تـا ئاستێك، كە خەریكە لێی دەردەچـن، هێشتاش هـەر وادەزانـن، كـە لەسـەر ڕێگای ڕاست ماون!هەروەها ئەو وێنە جێبەجێكاریەی، كە ئیسلامی وەكـو خۆی تێدا جێبەجێ دەكرا، كە بە پێوەرێكی واقیعی دادەنێین، بریتیـە لـە سەردەمی سەرەتای سەرهەلْدانی ئیسلام، كـە سـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ)و، سـەردەمی (خەلیفـەكانی ڕاشـیدین)ە، كـە ئیسـلامیان بـە هـەموو بنـەما و بنچینەكانی و ڕەووشت و پێوانەكانی تێدا جێبەجێدەكرد.

ئێمە باسی ئیسلامێك دەكەین، بەو شێوەیەی، كە خوا ناردوویەتیە خوارێ، باسی بەرنامەیەك ناكەین، كە نەتوانرێ لە واقیعدا جێبەجێ بكرێ، چونكە هەر مرۆڤ بوو، كە لەسەردەمێكدا جێبەجێی دەكرد، خۆ ئەوان فریشتە نەبوون و، بوونەوەرێكی جیاوازیش نەبوون، بەڵكو بە مرۆڤایەتی خۆیان وەكو خۆی جێبەجێیان كردووە، سەرەڕای بوونی خاڵی بەهێز و بێهێز و، توانای بەرز و نزم لە سرووشتی مرۆڤدا.

ئێمە تەنها ناگەڕێینەوە سەر سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و، سەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدین-ڕەزای خوایان لەسەربێت-بەڵكو باسی هەموو سەردەمەكانی تریش دەكەین، كە پێغەمبەر(ﷺ)بە ڕیزبەند باسی كردوون، فەرموویەتی: خیر القرون، قرني، ثم الذي یلیە، ثم الذي یلیە)رواە الشیخان. واتە:باشترین سەردەم، سەردەمی منە، پاشان ئەوەی لەدوای دێت، پاشان ئەوەی لە دوای دێت.

لەڕاستیدا شتی زۆر لە ڕووكاری ژیانی جۆراوجۆردا گۆڕاون، بەشێوەیەك كە ژیانی سەردەمی ئەمڕۆمان زۆر جیاوازە لەو ژیانەی كە نەوەی سەرەتای لەدایك بوونی ئیسلام تێیدا دەژیا، بەڵام كێشەیەكی بنەڕەتی هەیە (كە لە بەشی داهاتوودا بەدرێژی دەربارەی دەدوێین)، ئەویش ئەوەیە:ئایا كامیان حوكمی كامیان دەكات؟ئایا نەگۆڕ حوكمی گۆڕاو دەكات، یان گۆڕاو حوكمی نەگۆڕ دەكات؟ئایا لەڕاستیدا كامیان جێگیر نیەو بەردەوام دەگۆڕێت؟ناوەڕۆك(الجوهر)یاخود ڕووكەش(المظهر)؟

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە، كە دەڵێن ئیسلام بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی ژیان ناشێ، چونكە بە تەنها بەڕووكەش ناوەستێ و

لەناوەڕۆكیشدا گرنگی بە پاكی مرۆڤ دەدات!كە ئەمەش داوایەكی زەحمەتە، بەلاّم دیموكراسی ئەمە بە مەرج ناگرێ و، چاك و خراپ دەتوانن جێبەجێی بكەن و، وەدەستخستن و جێبەجێكردنی ئاسانترە و، زیاتر دەتوانێ چارەسەری كێشەكانی خەلّك بكات!

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە، كە دەلّێن ئیسلام بۆ چارەسەركردنی كێشەكان ناشێ، چونكە پشت بە ناخی تاكەكەس دەبەستێ، كە كۆت و مەرجی نین، بەلاّم هەرچی دیموكراسییە، پشت بە كاری ڕێكخراوەیی دەبەستێ، كە كارا ترە لە تاكەكەس!هەروەكو بلّێی ژیانی موسولّمانان لە بوونی ڕێكخراو و دامەزراوەكان خالّی بووبێ!هەروەكو كاری گرێبەست سازكردن و چارەسەری كێشەكان كاری ڕێكخراوەیی نەبووبن!هەروەكو كاری چارەسەركردنی كێشە بازرگانییەكان كاری ڕێكخراوەیی نەبووبن!هەروەكو كاری ئەمر كردن بە چاكە و نەهی كردن لە خراپە و ڕێگرتن لە گێرە شێوێنی كاری ڕێكخراوەیی نەبووبن!هەروەكو خانەی سامان(بيت المال)ڕێكخراو نەبووبێ!هەروەكو ئەمانە تەنها خەون و خەیالّ بووبن و بەهەواداچون!

****

ئێمە لەم كتێبەدا مەبەستمان دانانی چارەسەری دوور و درێژ نیە بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی، كە خەلّك لەسەردەمی ئێستادا تێیدا دەژین، چونكە ئەمە كارێكە بەتەنها بە تاكە كەسێك ناكرێ، بەلّكو ئەمە بەچەند شەرعزان و لێكۆلّەرەوەیەكی شارەزا لە هەموو بوارەكانی ژیاندا ئەنجام دەدرێت، كە كۆشش بكەن بۆ هەلّێنجانی حوكمی گونجاو لە قورئان و سوننەتداو، بۆ ژیانی ئێستامان و، بۆ جێبەجێكردن ئامادەیان بكەن،

بەڵکو لێرەدا چەند ئاماژەیەك بە چەمکە سەرەکییەکانی ئیسلام دەکەین و، بە کورتی باسی دادگەری سیاسی لە ئیسلامداو، دادگەری ئابووری و، دادگەری کۆمەڵایەتی و، دادگەری لە نێوان پیاو و ئافرەت لە ئیسلامداو، تێڕوانینی ئیسلام بۆ تاوان و سزا دەخەینەڕوو، سەرەڕای ئاماژەکردن بەچەند باسێکی تر، کە پێویست بێت ئاماژەیان پێبکەین.

ئێمە لێرەدا بانگەواز بۆ دوو شت دەکەین.

بانگەوازی ئوممەت دەکەین، کە لەخەوەکەی وەخەبەر بێ و، ویست و ورەی گەڕانەوەی هەبێت بۆ خوای پەروەردگار، چونکە جگە لە گەڕانەوەی ڕاستەقینە بۆلای خوا، هیچ ڕێگای ڕزگاربوونی دی لەبەردەمدا نین.

هەروەها بانگەوازی ئوممەت دەکەین، کە دووبارە-سەرلەنوێ-ئایینەکەی خۆی بناسێت و پێیدابچێتەوە، تا بتوانێت ئەوەی دادگەری ژیانی خەڵکیە لەهەموو بوارەکاندا، کە پێی وەدی دێ، تێیدا بدۆزێتەوە، هەروەکو خوای پەروەردگار لە کتێبەکەیدا باسی کردووە، لەگەڵ دڵنیاییەکی تەواو، کە فەرموودەی خوا حەقەو، ئەوەی خوا بڕیاری لەسەرداوە حەقەو، تاکە ڕێگای ڕزگاربوون لە دونیاو دواڕۆژدا هەر ئەوەیە، کە خوا بڕیاری لەسەر داوە.

بەڵام هۆشیاریی پێویست و دەست پێشخەرییەکانی بە یارمەتی خوا دەستی پێکردووە، تەنها ئاماژەیێکی خێرای بۆ دەکەین. خوای پەروەردگار ناهێڵێ ئەم ئوممەتە گومڕابێ و، لە ڕەحمەتی بچێتە دەرەوە، بەڵکو هەرکاتێ لە دینەکەی بێ ئاگابوون، بەردەوام کەسێك دەنێرێت، تا دینەکەی نوێ بکاتەوە. ئەوەی بۆمان ڕوونەو لامان دیارە، کە ئەم کارەی

لەسەردەمی ئێستاماندا بە دوژمنەکانی ئوممەت سپاردووە، چونکە بەو گەوجێتیانەی ئەنجامی دەدەن کار بۆ وەخەبەرهاتنی ئوممەت و زیندووکردنەوەی دەکەن، تا سەرلەنوێ دینەکەی بناسێتەوە. ئیتر بە پشتیوانی خوا سەرلەنوێ لەدایک دەبێتەوەو دونیا پڕ دەکات لە دادگەریی، هەروەك چۆن پڕ بووە لە زوڵم و ستەم، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) لەسەردەمی خۆی باسی کردووە.

﴿ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ هود: ٨٨

محمد قطب

# نەگۆڕ و گۆڕاو( الثابت والمتغير )

هەندێك كەس ئەو گومانەیان لا درووست دەبێت، كەچۆن شەریعەتێك پێش چوارده سەدەو، لەبارودۆخێكی تەواو جیاواز لەم رۆژگارەی تیایدا دەژین هاتۆتە خوارێ، دەتوانێت حوكمی ئەو واقیعەی ئەمڕۆ بكات، لەكاتێكدا، كەبارودۆخەكە تەواو گۆڕاوە، بەڕادەیەك، كەهیچ وێكچوونێك نابینین لەنێوان واقیعی ئەمڕۆ و دوێنێدا، كە ئەم شەریعەتەی تێدا دابەزیوە!

ئەگەر دان بەوەدا بنێین، كە ئەم شەریعەتە لەكاتی خۆیدا گۆڕانێكی گەورەی ئەنجام داوە بەگواستنەوەی مرۆڤ لەو نەفامییەی، كەتیایدا دەژی بۆ ئاداب و ئاكارێك، كەبەبیری هیچ كەسدا نەدەهات لەو سەردەمەداو، مرۆڤی لەو چاڵەی، كە تێی كەوتبوو ڕزگار كردو، بەرزی كردەوە، بەرزتر لەوەی، كە شارستانیەتی و زانیاری ئەو سەردەمە پێی گەیشتبوو... ئەگەر دان بە هەموو ئەوانە دابنێین، ئایا ئەم شەریعەتە هەمان بەرزی و پێشكەوتنی ماوە لەم ڕۆژگارەماندا، كە چەند هەنگاوێكی گەورەی ناوە لەپێناو پێشكەوتن و شارستانیەتدا، یاخود كۆنە پەرست و بێتوانایە بەرانبەر ئەم گۆڕانە؟ئایا بۆ مرۆڤی ڕۆژگاری ئەمرۆمان دەشێ، وەك چۆن شیاو بوو بۆ مرۆڤی دوورگەی عەرەبی پێش چوارده سەدە؟.

لەبەر گرنگی ئەم گومانە لەبیری هەندێ خەڵکدا —یان زۆربەیان-ئەم بەشەی کتێبەکەی بۆ تەرخان دەکەین، بۆ ئەوەی، کە ڕاستی ئەم کێشەیە لەدوو ڕووەوە دەربخەین:لەڕوی ئەو وەحیەی، کەلەلای خواوە نێردراوەتە خوارێ و، لەڕێگای مرۆڤ و گۆڕانەکانی بەدرێژایی مێژوو، لەڕوی وەحیەوە:ئەوانەی ئەم گومانەیان لا دروست دەبێت بێ ئاگان لەوەی، کە خوای پەروەردگار ئەم ئایینەی تەنیا بۆ دانیشتوانی دورگەی عەڕەبی نەناردووە، هەرچەندە کە دورگەی(عەڕەب)یشی وەکو شوێنی دەستپێکردنی بانگەوازەکە دیاری کردووە، چونکە خودا زاناترە، کە پەیامەکەی لەکوێ دادەبەزێنێت. بەڵکو بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ناردووە، بۆیە هەر لە ڕۆژانی یەکەمی پەیامەکەیەوە، کاتێك، کەموسوڵمانانان کەمینەیەکی چەوساوە بوون و، لەچەند کەسێك تێپەڕیان نەدەکردو، بانگەوازەکە هێشتا سەرەتابو، بە سەختترین جۆری بەرەنگاری ڕێگریان لێدەکرد، بۆیە وەحی لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ)جیهانییەتی بانگەوازەکەی دەردەخست و ئەوەی پیشان دەدا، کەموحەممەد(ﷺ)بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴾ التكوير: ٢٧. واتە:ئەم قورئانە تەنها یادخەرەوەیە بۆ سەرجەم دانیشتوانی زەوی(بۆ پەری و ئادەمیزاد لە هەموو سەردەمەکاندا). ﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴾ القلم: ٥٢. واتە:لەکاتێکدا قورئان بریتیە لە یادخستنەوەو بێدارکەرەوەی هەموو خەڵکی ئەم جیهانە(ئەگەر تێفکرن). ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا ﴾ سبأ: ٢٨ واتە:ئێمە تۆمان بۆ سەرجەم خەڵکان ڕەوانەکردووە.

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ﴾الأعــــراف: ١٥٨
واتە: ئەی موحەمەد(صلى الله عليه وسلم)بڵێ ئەی خەڵكینە بەڕاستی من پێغەمبەر و فروستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی.

هەموو ئەو ئایەتانەش لە مەككەدا و پێش بڵاوبوونەوەی ئەم دینە بە زەویدا و، دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەدا هاتوونەتەخوارێ.

لەلایەكی ترەوە ئەم كەسانە بێئاگان لەوەی، كە خوا ئەم دینەی بۆ ئەوە ناردووە، كە ژیانی خەڵك بەڕێوە ببات، تاوەكو خوا زەوی و دانیشتوانەكەی بۆ خۆی دەباتەوە، چونكە خوای پەروەردگار كاتێكی دیاریكراوی دانەناوە كە، لەدوایدا مرۆڤ بەم دینەوە پابەند نەبێت، بەڵكو خوای پەروەردگار دوو ڕاستی وەدیار خستوون، كە هەر یەكێكیان بەڵگەی خۆی هەیە:یەكەمیان تەواوی و تۆكمەیی دینەكەیە:﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ المائــدة: ٣. واتــە: ئەمرۆ ئایین و بەرنامەكەتانم بە كۆتایی گەیاندو ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو كردن، ڕازیم بەوەی، كەئیسلام ببێتە بەرنامەو ئایینتان.

دووهەمیش بریتیە لە كۆتاهێنان بە پێغەمبەرایەتی ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴾ الأحـزاب: ٤٠. واتــە:موحەممــەد(ﷺ) بـاوكی هـیچ كـەس لـە پیاوانتـان نـەبوو، بـەڵكو پێغەمبـەری خـواو، دواهـەمینی پێغەمبەرانــە، هەمیشـەو بـەردەوامیش خـوا بـە هـەموو شـتێك زانایـە. كەواتـە دینەكـە تــەواو تۆكمەیــەو، نــەلێی كــەم دەكرێــت، نــەبۆی زیــاد دەكرێــت،

پێغەمبەرایــەتیش کۆتــایی پێهــات، ئــیتر هــیچ پەیامبــەرێك دوای موحەممەد(ﷺ)نیە، واتە لەلای خودای پەروەردگار کارەکە جێگیر بووە، بەو وێنەیەی، کە ناردوویەتیە خوارێ و، تا کۆتایی ژیان لە سەر زەویدا دەمێنێتەوە.

هەروەها ئەم کۆمەڵەی خەڵك دوو سیفەتی خوای بەرز و توانا نەرێ(نفی) دەکەن-ئەگەر مەبەستیشیان ئەوەنەبێت، ئەگەر هەستیشی پێ نەکەن-کە سیفەتی زانست(العلم)و دانایی(الحکمة)ن، بەجۆرێك کە لایان وایە ئەوکاتەی خوای پەروەردگار ئەم دینەی ناردووەتە خوارێ، نەیزانیوە، کەگۆڕانکاری گەورە لەجیهانی مرۆڤدا روو دەدەن!.

وەك بڵێی دانایی (الحکمة)ی نەبووە، کاتێك خەڵکی ناچارکردووە، بەشتێك کەدوای ماوەیەك حیکمەتەکەی نەمێنێت!لەکاتێکدا، کە خوا هەرخۆی زانا(العلیم) و دانا(الحکیم)ە، وەك چۆن لەکتێبەکەی(قورئان)دا وەسفی خۆی کردووە و بەم شێوەیەی، کە ئیمانداران ئیمانیان پێیەتی، ئەمە لەڕووی وەحیەوە، کە مەبەستەکەی ڕوون و ئاشکرایە. بەڵام لەڕووی (مرۆڤ)ەوە، کارەکە پێویستی بەڕوونکردنەوەی زیاترهەیە. لە ڕاستیدا گۆڕانی مەزن لەژیانی مرۆڤدا ڕویداون، هەرلەسەرەتای دەستپێکردنی ژیانی، تا ئەم رۆژگارەی تیایداین، بەجۆرێك کەئەگەر بەخێرایی چاوی پێدا بخشێنین، دەبینین هەمووشتێك تیایدا گۆڕاوە، بەوپێیەی کە هیچ پەیوەندیەك لە نێوان مرۆڤی دوێنێ و ئەمڕۆدا بەدی ناکەیت!

بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین بۆمان دەردەکەوێت، کە گۆڕانە مەزنەکان هەموویان لەڕووکار(مظهر)ی ژیاندا ڕوویانداوە، نەوەکو

لەناوەڕۆك(جوهر)ی ئەو خواستانەی، کە مـرۆڤ لەناخـەوە دەجولێنێت و ڕێگای ژیانی پێ نیشاندەدات.

هەر لە سەدە سـەرەتاییەکانەوە، دووجـۆر لـە دەروون(نفس)ی ئـادەمی هـەبوون، کـە هەریـەکێکیان چـەند هەسـتێکی جیـاواز لـە وی دیکـەی لـە خۆگرتبـوو، ڕەفتاریشـیان تـەواو لەیـەکتر جیـاوازن﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

المائـدة: ٢٧ - ٢٩ واتـه: بەسـەرهات و هـەواڵی دوو کوڕەکـەی ئـادەم(علیـه السلام)بـۆ ئەوخەڵکە بخوێنـەوە، کە بەڕاسـتی ڕوویـداوە، ئـەوەبوو کاتێـك هەردووکیان قوربانیـان کـرد، لەیـەکێکیان وەرگیرا(کە لەسـەر حـەق بـوو، لەخوا ترس بوو)لەوی تریان وەرنەگیرا(چونکە ڕق ئەستوور و حەسوود و خوانەناســبوو)بەبراکــەی ووت:هــەر دەتکــوژم، ئــەویش لـــەوەڵامی هەڕەشەکەیدا گوتی:خوای گەورە تـەنها لـە پـارێز کاران قوربـانی و چاکە وەردەگرێت، سوێند بـەخوا ئەگـەر تـۆ دەسـت درێـژیی بکـەیت بـۆ مـن بـۆ ئەوەی بمکوژیت، من دەسـت درێـژیی ناکـەم بـۆ تـۆ، بـۆ ئـەوەی بـت کـوژم، چـونکە بەڕاسـتی مــن لەســزاو تۆڵـەی خـوا، پـەروەردگاری جیهانــەکان دەترسم، (من بەو دەسـت درێـژ نـەکردنـەم)بەڕاسـتی دەمـەوێت بـەگوناهی

من و گوناهی خۆشتەوە بگەڕێیتەوە، ئەوجا دەبیتە نیشتە جێ ی ناو ئاگر، هەرئەوەشە پاداشتی ستەم کاران.

کەواتە چی گۆڕاوە لەم جیهانەی ئێستامان، بەبەراوورد لەگەڵ جیهانی پێشوو، یاخود لەگەڵ سەرەتاکانی ژیانی ئادەمیزاد لەسەر زەوی؟

ئایا ئێستاش هەمان خواست و ئارەزوی بەدکاری وخراپی مرۆڤ نیە، وای لێدەکات دەست درێژی بکاتە سەرماف کەسانی دی؟ئەمە هەموو تاك و کۆمەڵان و ئەو وولاتانەش دەگرێتەخۆ، کە پەیرەوی ستەم و زۆرداری دەکەن بەسەر هی دیکەدا، جا مەبەستیان تەماعکاری و حەسوودی بێت، یان خواستی دەست گرتن و فەرمانڕەوایی و زۆرداری بێت بەسەر ماف کەسانی دی دا.

## ئیتر چی گۆڕاوە؟!

مرۆڤە سەرەتاییەکان پارچە پێستێکی ئاژەڵ، یان پارچە قوماشێکیان بەسەر خۆیاندادەدا، پاشان شەیتان دەهات و لەخشتەی دەبردن، تا لەش و عەورەتیان وەدیارکەوێ، ئیتر لەوکاتەوە مرۆڤ شێوازی هونەری لە درووست کردنی جل و بەرگدا بەکار دێنێ ودەیڕازێنێتەوە و، نەخش و نیگاری تێدا درووست دەکات و، جۆرەها هونەری تێدا بەکاردێنێ، پاشان شەیگانیش ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و لەخشتەی دەبات بەداکەندنی جلەکانی لە شوێن و کاتی دیاری کراودا، کە هەمان تاوان کەپێشتر ڕوویداوە دووبارە دەبێتەوە﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ

مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾الأعـــراف: ٢٧.

واته:ئەی نەوەی ئادەم:شەیگان، ئێوەش لە خشتە نەبات، هـەروەك بـاوك و دایكتانی لەخشتە بردو لە بەهەشتدا بـەدەركردنی دان، لەكاتێكـدا دەسـتی كرد بەداماڵینی پۆشاكەكانیان، تا عەورەتیان پیشانی یەكتر بدەن، بێگومان شەیتان و دارودەستەكەی ئێوە دەبینن لە شوێنێكدا كە(دنیایە)ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیابن ئێمە شەیتانەكانمان كردووە بە یارو یـاوەری ئەوانـەی باوەڕناهێنن.

## ئیتر چی گۆڕاوە؟!

با لە شەیتان و گومڕاییەكانی گەڕێین و بێینە سەر مرۆڤ!

مرۆڤ لە ئەشكەوتەكاندا نیشتەجێ بـوو، نـەخش و نیگارەكـانی لەسـەر دیـواری هەنـدێ لـە ئەشـكەوتەكاندا مـاون، كـە شـایەتی ئـەو سـەردەمە مێژووییەن، پاشان ژیانی شارستانیەتی بەخۆیەوە دی و خانووی لە گـەڵاو پوش و قامیش درووست دەكرد، یاخود لە خشت و بـەرد، یـاخود خیـوەتی هەڵـدەدا، كــە لــە گــەرما و ســەرما دەیپاراســت، پاشــان ژیــانی زیــاتر شارســتانیەتی بەخۆیــەوە دی و خــانوی زل و قەســر و قســوری بــەرزی هـەوربڕی درووسـت كـردن و، ئـاوو كارەبـاو ئـامرازو ئـامێرو... هتـدی بـۆ زیادكرد.

ئیتر چی گۆڕاوە؟خواستی نیشتەجێ بوون-ناوەڕۆكی-یاخود ئەو شكڵ و ڕووكارەی، كە خواستی نیشتەجێ بوونی پێ وەدی دێنێ؟!

هەروەها مرۆڤ بۆ خۆراكی پشتی بە ڕاوو ڕاووشكارو بەرهەمی درەخت دەبەست و، خۆراكەكەی هەر بە كاڵی دەخواردو پێش ئەوەی، كە ئاگر بدۆزێتەوە، پاشان كشتوكاڵی دۆزییەوەو، چەندەها ڕووەكی جۆراو جۆری ڕواندن و بۆ درووست كردنی خۆراكەكەی بەكاری دەهێنان، پاشان پێشكەوت و درووست كردنی خۆراكیشی كردە جۆرێك لە هونەرو، چەندەها ئامرازی جۆراوجۆری بۆ ئەم هونەرە درووست كردن، وەكو كەوچك و چەنگاڵ و چەقۆ و، چەند ئاداب و ڕێسایەكی دانان، كە لەكاتی خواردندا پەیڕەویان بكات، ئیتر چی گۆڕاوە؟ویستی خواردن-ناوەڕۆكی- یاخود ئەو شكڵ و شێوازەی، كە خواستی خواردنی پێ وەدی دێ؟!

هەروەها مرۆڤ لەململانێی لەگەڵ دوژمنەكانی-ئاژەڵ و مرۆڤ-چەند ئامرازێكی سادەی بەكار دەهێنان، كەكوشندە، یاخود بریندارکەر بوون، تەنها دوژمنیان وە دوور دەخستەوە، پاشان لەمەشیان پێشكەوتنی بەخۆیەوە دی، ئامرازی كوشندەتری وەكو ڕم و شمشێر و تیری بەكار هێنا، پاشان زیاترو زیاتر پێشكەوت و چەكی قڕكەر و فەوتێنەری وەكو بۆمبی گەردیلەیی و ئەتۆمی و هایدرۆجینی و گازی ژەهراوی و كوشتنی بەكۆمەڵ لەدوورەوە لەڕێگەی تۆپ و موشەك، كە لەڕێگای وشكانی، یان دەریایی، یان ئاسمانی ڕەوانە دەكرێن، داهێنان.. ئیتر چی گۆڕاوە؟ویستی شەڕ-ناوەڕۆكی-یاخود ئەو ئامرازانەی، كە مرۆڤ خواستی شەڕی پێ وەدی دێنێ؟!

خواستی شەڕ چ بەرگری كردن بێت لە خۆ، یان وەكو دەست درێژی كردن بێت بۆ سەر خەڵكانی تر، ئایا هیچ لە ناوەڕۆكی گۆڕاوە؟یاخود ناوەڕۆك(الجوهر)ەكە، هەر هەمان شتە بە درێژایی مێژوو و، ئامرازەكانی

گـۆڕاون، لـەم ئامرازانــەش شـێوەی نـوێی تێکـەوتوون، وەکـو تـەماعکاری سیاسی و ئـابوری و زانسـتی و .. هتـد. سـەرەڕای ئـەوەی، کـە پاڵنەرەکـەن نەگۆڕاون، هەر لە سەرەتای مێژووەوە، تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

هـەروەها مرۆڤبـە پێیـەکانی لـە شـوێنێکەوە دەچووە شـوێنێکی تـر و، هەندێ ئاژەڵی دستەمۆ کردن و بەکاری هێنان بۆ سواری و بارگواستنەوە، لەمەشـدا پێشـکەوتنی بەخۆیـەوە دی و ئۆتۆمبیـل و فرۆکـەو موشـەکی داهێنـا، سـەرەڕای ئـەو ئامرازانـەی، کـە چاوەڕوان دەکرێـت لـە داهـاتودا بدۆزرێنەوە، ئیتر چی گۆڕاوە؟خواستی گواستنەوە-ناوەڕۆکی-یاخود هۆکار و ئامرازی گواستنەوە؟!لەلایەکی ترەوە، ئایا ئـەو ئامرازانـەی لەئاسمانـەوە بۆ هاتونەتەخوارێ، یاخود هەمووئەمانە ویستی مرۆڤ و بیرۆکەو خـەیاڵی بوون و دواتر لە ڕاستیدا وەدی هێناون؟

ئا بەم جۆرە!ئەگەر سەیری هـەموو ئـەو گۆڕانانـە بکـەین، کـە لـەژیانی مرۆڤدا ڕوویانداون، ئەوادەبینین، کە ئـەم ڕاسـتییە لەهەموولایەکدا بـەرەو ڕوومان دەبێتەوە:ناوەڕۆك(جوهر)ی نەگۆڕ و، وێنەی بەردەوام گۆڕاو.

ڕاسـتە شـکڵ و شـێواز بـەردەوام لـە گۆڕانـدان و شـێوازی ڕەفتـاری جۆراوجۆر و گۆڕاو درووست دەکەن، بەڵام لێرەدا ئـەو پرسـیارە درووست دەبێت، کە پێویسـتە بەشـێوازێکی بابەتیانـە ڕووبـەڕووی ببینـەوە:کاتێـك شێواز دەگۆڕێت و ڕەفتاریش دەگۆڕیت، ئایا ئەو ڕەفتـارە گۆڕاوە، جگـە لـە ئەرکی ڕەفتاری پێشوو دەتوانێت فەرمانێکی دی وەدی بێنێ؟یاخود هەمان کاری پێشووە و شێوازەکەی گۆڕاوە؟

ئا لێرەدایە گرێ ی بابەتەکە، کە تێڕوانینـی بابەتەکـەی لەسـەر بنیـات بنرێت.

کاتێك، کە سیستەمێك بۆڕێکخستنی مرۆڤ دادەنرێت، ئایا ڕەفتار لەگەڵ پێکهاتــە جێگیرەکانــدا دەکــەی، یــان لەگــەڵ ئەوانــەی، کــە بــەردەوام لەنوێبونــەوە و گۆڕانــدان، یاخودلەگــەڵ هەردووکیان؟پاشــان‌ئەگــەر هەردووکیان بخەیتە ناو هاوکێشەکەت، چەند نمرە بەنەگۆڕەکان (الثوابت) دەدەی و چـەندی بـە گۆڕاوەکـان(المتغیرات)دەدەی، کـە نـاوەڕۆك (الجوهر) ناگۆڕن؟

بەدیویێکی دی: لەژیانی مرۆڤدا چۆن ڕەفتـار لەگـەڵ نـەگۆڕ و گـۆڕاودا دەکەی ؟

ئیسلام‌دینی خوا، ئایینی فیترەت و سرووشت‌بۆ ئەم کارە مەنهەجێکی تەواو و تۆکمەی داناوە.

ئـەو شـتانەی کـە لـە ئیسـلامدا نـاگۆڕێن، ئیسـلام زۆر گرنگـی پێـداون، چـونکە کۆڵەگـەی ژیـانن و، چـەندەها یاسـاو ڕێسـای نـەگۆڕو ڕوونیـان لـە بارەوە هاتوونەتـە خـوارێ و، فـەرمانی بـە پـەیڕەوکردنیان کـردووە بـەبێ گۆڕانکـاری. بـەڵام لەشـتە گۆڕاوەکانـدا بـواری بـۆ عـەقڵ جێهێشـتووە، کـە کۆشـش(اجتهـاد)یـان تێـدا بکـات، لەهـەڵێنجانی ئـەو حوکمانـەی، کـە بـۆی گونجاون، بەڵام چەند مەرجێکی بۆ داناون، کە بەنـەگۆڕەکان(الثوابـت)ەوە گرێیـان دەداتـەوە:بـەجۆرێك، کـە هـیچ حـەرامێك حـەڵاڵ نـەکات و هـیچ حەڵاڵێك حەرام نەکات و، لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا تێك ناگیرێت. بۆیە عەقڵی کەسی موسوڵمان هـیچ کێشـەیەکی بەرانبـەر نـەگۆڕ و گـۆڕاو لەکاروباری ژیاندا نەبووە، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان هەسـتی بـەوە نـەکردووە، کـە پێویستی بەگۆڕینی نەگۆڕەکان هەیە، یان پەیوەندی نێوانیان بپچڕێنێت.

هەرچەندە لێرەدا بواری درێژە پێدانمان نیە، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی هەندێك نموونە دێنینەوە.

لە دیارترین ئەو شتانەی، کە ئیسلام جێگیر(ثابت)ی کردوون، ئایین(الدین)ە، بەواتای پەرستنی خوای پەروەردگار بەتەنهاو بەبێ هاوبەشی بۆ بڕیاردان. ئیسلام ئەمەی جێگیر کردووە و زۆر جەختی لەسەر کردووەتەوە و کردوویەتیە تەوەری هەموو کارەکان.

ئەم کارەش بەبێ حیکمەت نیە-حاش لله-بەڵکو مەبەستێکی گەورە و کاربەجێیی پەروەردگاری لەپشتە، چونکە هەرتەنها خودا زانا(العليم)و کاربە جێ(الحكيم)ە و، تەنها کاری بەحیکمەت و زانستی لێدە وەشێتەوە و، دەربارەی ئەو شەوەی، کە قورئانی پیروزی تێدا ناردووەتە خوارێ بۆ ئاسمانی زەوی، فەرموویەتی:﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَـٰهُ فِى لَيۡلَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ﴾ الدخان: ٣ - ٤ . واتە:بەڕاستی ئێمە لە شەوێکی بەفەڕ و پیرۆز(کە شەوی قەدرە)دامانبەزاندووەتە خوارەوە، بێگومان ئێمە هەمیشە بێدارکەرەوەی بەندەکانمانین. لەو شەوەدا هەموو کار و کردەوە و بەرنامەیەکی پڕ لە حیکمەت و دانایی لەیەك جیادەکرێتەوە.

(نەگۆڕ)یی ئایین لە قورئاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستیەکی ئەزەلی(هەمیشەیی)ئەویش پەرستراوێتی خوا و، تاك و تەنهاییەتی، هەروەك چۆن، کەئەسڵی مرۆڤایەتی خواستی خواپەرستی لەناخیدا ڕوواوە، کە پەروەردگار بەبەریا کردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ خوای پەروەردگاری بناسێت و بیپەرستێت﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن

﴿ ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۛ ﴾
الأعراف: ١٧٢

واتە:یادی ئەوەش بکەوە کەپەروەردگارت پشتاو پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە(لەجیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن)و کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە و(پێی فەرموون):ئایا من پەروەردگاری ئێوەنیم؟!ووتیان:بەڵێ شایەتیمان داوە(کە تۆ پەروەردگارمانیت).

داخوازی و پێویستی هەردوو ڕاستیەکە ئەوەیە، کە مرۆڤ خوای پەروەردگاری بپەرستێت، بەبێ هاوبەشی بۆ بڕیاردان، چونکە بەتەنها ئەو شایەنی پەرستنە و، بەتاك زانینی لە پەرستراوێتی و پەروەردگاریەتی و ناو و سیفاتەکانیدا پێویستە.

بەڵام خوای کاربەجێ نەیویست مرۆڤ لەعیبادەت و پەرستن دا بەزۆر ملکەچ بکات، هەروەکوچۆن ئاسمان و زەوی ملکەچ کردوون، بەڵکو بیر و هۆش و سەربەستی و ویستی داوەتێ، داوای پەرستنێکی بەهۆشداری لێکردووە، کە لەسەر بیرکردنەوە و تێفکرین و قەناعەتەوە بنیات نرابێ، لێرەوە ئادەمیزاد بوون بەدوو کۆمەڵەوە:یەکێکیان لەسەر بنچینەی فیتڕەت و پاکی ماوەتەوەو، بیری کردۆتەوەو تێفکریوە و، بەو ئەندامانەی، کە پەروەردگار بۆی مەیسەر کردوون، کە بیریان پێ بکاتەوەو پێیان تێفکرێت:بیستن و بینین و دڵ و دەروون-ئیتر دڵنیا بووە، کە هیچ خودایەك جگە لە(الله)نیەو، هەر ئەو تاك و تەنهایەو هیچ هاوبەشی نیەو، بەدەنگ فەرمانی خوداوە هاتوون﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴾

النساء: ٣٦. واته‌:(ئه‌ی خه‌ڵكینه‌)ته‌نها خوا بپه‌رستن و هیچ جۆره‌ شه‌ریك و هاوه‌ڵێكی بۆ بڕیار مه‌ده‌ن.

هه‌روه‌ها دڵی ئارام گرتوو بووه‌ به‌یادی خوا﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨. واته‌: ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕیان هێناوه‌ و دڵ و ده‌روونیان ئارام ده‌بێت به‌ قورئان و په‌یامه‌كه‌ی خوای په‌روه‌ردگار، ئاگاداربن دڵه‌كان هه‌ر به‌ قورئان و یادی خواو(پابه‌ندبوون به‌ ئایینه‌كه‌یه‌وه‌)خۆشنوود ده‌بن و ده‌حه‌وێنه‌وه‌.

كۆمه‌ڵێكیشیان له‌ فیتره‌ت و ئه‌سڵی خۆیان لایانداوه‌و، باوه‌ڕیان به‌ غه‌یری خوا هێناوه‌، چ له‌گه‌ڵ خوا هاوبه‌شێكیان بڕیار دابێت، یاخود به‌بێ ئه‌و په‌رستراوێكی دیكه‌یان بۆ خۆیان بڕیار دابێت، ئیتر خه‌ڵك به‌و شێوه‌یه‌یان لێهاتووه‌، كه‌ په‌روه‌ردگار باسی كردوون﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾ التغابن: ٢. واته‌:ئه‌و زاته‌ ئه‌وه‌یه‌، كه‌ ئێوه‌ی دروست كردووه‌، جا هه‌تانه‌ بێ باوه‌ڕه‌و هه‌تانه‌ باوه‌ڕدار. په‌رستنیش بووه‌ته‌ دوو جۆر:یان په‌رستنی خوا، یان په‌رستنی شه‌یتان﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَـٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾ يس: ٦٠ - ٦١. واته‌:ئه‌ی نه‌وه‌ی ئاده‌م، مه‌گه‌ر من پێم ڕانه‌گه‌یاندن، كه‌ شه‌یتان نه‌په‌رستن، چونكه‌ ئه‌و به‌ڕاستی دوژمنی ئاشكراتانه‌، به‌ڵكو ته‌نها من بپه‌رستن، كه‌ هه‌ر ئه‌مه‌یه‌ ڕێگه‌و ڕێبازی ڕاست و درووست. په‌رستنی غه‌یری خوا پاڵدراوه‌ته‌ پاڵ شه‌یتان، چونكه‌ ئه‌و(شه‌یتان)بانگه‌واز بۆ ئه‌و جۆره‌ په‌رستنه‌ ده‌كات و له‌دڵی

بێباوەڕان شیرینی دەكات و بۆیانی دەڕازێنێتەوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا تیشكی بخەینەسەر ئەوەیە، كە ئەو دەستەیەی لە فیترەتی خۆیان لایانداوە، لادان نەبووە لە خودی پەرستن، چونكە مرۆڤ سرووشتی وایە، كە ناتوانێت بەبێ پەرستراو هەڵ بكا، بەڵكو ئەو لادانە تەنها لە ئاراستەكردندا بووە، كە لەجیاتی ئەوەی بەرەو خوای ڕاست و حەق بچێت، كە ئاسمانەكان و زەوی شایەتی خوایەتی دەدەن و تاكێتی دەسەلمێنن، بەرەو ئاراستەی پەرستراوی دی چوون، بە هاوبەشی پەرستنی بێت لەگەڵ خوا، یاخود بەتەنها پەرستنی بێت.

هیچ مرۆڤێك نیە پەرستش(عبادة) نەكات! چونكە پەرستش لە فیترەت و ئەسڵی مرۆڤدا هەیە! بەڵام لە مرۆڤێك بۆ مرۆڤێكی ترەوە جیاوازە، بەوەنا، كە یەكێكیان پەرستش دەكات، ئەوی دی نا، بەڵكو بەوەی، كە یەكێكیان خوای حەق دەپەرستێت، ئەوی دی غەیری خوا دەپەرستێت.

ئەم خاڵە خاڵێكی گرنگە، كە پێویستە ڕوونی بكەینەوەو، جەختی لەسەر بكەینەوە، چونكە نەفامیەتی ئێستا(الجاهلیە المعاصرە)هەستی پەرستن لەناخی مرۆڤدا نەفی دەكات(دوای كەمێك دەگەڕێینەوە سەر ئەم خاڵە) و، پشت بە واقعی ئێستا دەبەستێت و، ئیددیعای ئەوە دەكات، كە مرۆڤی وا هەیە هیچ شتێك ناپەرستێت و، ئەو بیرۆكەیەی لەسەر بنیات دەنێت، كە پەرستن لە ئەسڵی مرۆڤدا نیە، بەڵكو بەهۆی چەند بارودۆخێكی مێژوویی دیاریكراو گەشەی سەندووە، كە لەم ڕۆژگارەدا بوونی نەماوە!

ئـەم وەهـم و خەياڵـە-يـاخود ئـەو خـۆ هەڵەوەرييـەی-ی ئـەو جـۆرە كەسانە، لە قورئانی پيرۆزدا باسی لێوە كراوە، بەو پێيەی، كە ئەو كەسەی كـە ئيـدديعای ئـەوە دەكـات، كـە هـيچ شـتێك ناپەرسـتێت، ئـەوا هـەواو ئـارەزووی خـۆی دەپەرستێت، هـەروەكو پـەروەردگار لـە قورئـانی پـيرۆزدا فەرموويــەتی﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ الجاثيــة: ٢٣. واتــە:هــەواڵم بـدەرێ ئايـا ئەوكەسـەی، كـە ويسـت و ئـارەزووی خـۆی كردۆتـە خـوای خۆی؟!بەڵێ ئەويش پەرسـتن دەكـات، بـەڵام لەنەفسی خـۆی خوايـەكی بـۆ خۆی بڕيارداوە و، لەجياتی خوای حەق دەيپەرستێت.

كەواتە ئايين بەواتای پەرستنی خـوای حـەق-كـە لـە شـتە جێگيرەكانـە-گۆڕانكـاری بەسـەردا نايـەت، چـونكە بەچـەند ڕاسـتييەك گرێـدراوە، كـە بواری گۆڕانكارييان تێدانيـە، چ پەرسـتراوێتی خـوای پـەروەردگار و تـاك و تـەنيايی بێـت، يـاخود ئاڕاسـتە كردنـی فيتڕەتـی سـاغ و سـەليم بـەرەو پەرستنی خوای حەق.

قورئانی پيرۆز هەمووی بانگەوازە بۆ ئەم دينـە. كـە لەسـەرەتادا خـوای پەروەردگار بەبەندەكانی دەناسێنێت، پاشان بانگەواز بۆ پەرستنی دەكات، دواتر ئەو ڕێگايانـە نيشـانی بەنـدەكانی دەدات، كـە بەشـێوەيەكی ڕاسـت و درووست خوا بپەرستن.

سەرەتا ناساندنی خـوای پـەروەردگار﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ

سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾

**الحشر: ٢٢ - ٢٤. واتە:خوا ئەو زاتەیە، کە جگە لەو خوایەکی تر نیە، زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکراکان، ئەو خوایە بەخشندەو میهرەبان و دلۆڤانە، کانگای ڕەحم و بەزەییە، خوا ئەو زاتەیە، کە جگە لەو خوایەکی تر نیە، پاشای هەموو بونەوەرە، پاك و بێگەرد و پوختە، ئاشتیخواز و ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بەخش و پەناگەی ئیماندارانە، دەسەڵات دارەو، چاودێری دروستکراوەکانیەتی، باڵادەستە، خاوەنی خێری بێ سنوورە، گەورەیە و خۆی بە گەورە دەزانێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە لەوەی، کە تێنەگەیشتوان شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن. هەر ئەو خوایە بەدیهێنەر و درووستکارە، (لەنەبوون هەرچی بوێت بەدی دەهێنێت)، نەخشەو وێنە کێشەرە، ناوە پیرۆزو جوانەکان، هەموو شایستەی ئەون، هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدان ستایشی ئەو دەکەن، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی باڵادەست و دانایە.**

**هەروەها بانگەواز کردن بۆ پەرستنی خوایپەروەردگار بەتەنها و بێ هاوبەش بۆ بڕیاردان﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴾ النساء: ٣٦ واتە: ئەی خەڵکینە تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ ﴾ الزمر: ٢ - ٣**

واتە: بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە، کەواتە هەر خوا بپەرستە و دڵسۆز و ملکەچ بە بۆ ئایین و بەرنامەکەی. ئاگاداربن:دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە...

هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی، کە پەرستنی پەروەردگاری بەشێوەیەکی ڕاست و درووستی پێ وەدی دێ:

١-ئیمانێکی پتەو بەتاك و تەنیایی خوای پەروەردگار-جل جلالە- لەپەرستراوێتی و ناو و سیفەتەکانیدا.

٢- ئیمانێکی چەسپاو بە زیندوو بونەوەو، حەشر و حیساب و بەهەشت و دۆزەخ، کە خوای پەروەردگار باسی لێوە کردوون.

٣-هەموو درووشمەکانی پەرستن لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و ترس و تکاو پاڕانەوەو ملکەچی و پشت پێ بەستن بە تەنها بۆ خودا بێتبەبێ هاوبەش بۆ بڕیاردان.

٤-چەسپاندن و کارپێکردنی شەریعەتی خوا بەتەنهاو بەبێ ڕێباز و ڕێچکە لاوەکیەکانی تر.

٥-ئاوەدان کردنەوەی زەوی بەپێی ڕێبازی خوایی، واتە لکاتی ئاوەدانکردنەوەیدادەستگرتن بەو حەڵاڵانەی، کە خوا حەڵاڵی کردوون و، خۆ دوور گرتن لەو حەرامانەی، کە خوا حەرامی کردوون.

ئیسلام(دین)ی بەو مانایە جێگیر(ثابت)کردووە و، کردوویەتی بە چەق و تەوەر، کە هەموو شتەکانی تر لەدەوری دەسوڕێنەوە، ئەمەش لەیەك کاتدا دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار:

هۆکاری یەکەم ئەوەیە، کە ئەمە ماڤی خوایە لەسەر بەندەکانی، هەروەکو پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم-ڕوونی کردۆتەوە، کاتێك بە موعازی کوڕی جەبەل-ڕەزای خوای لەسەر بێت- فەرمووی:(یا معاذ هل تدري ما حق الله على العباد؟... ان یعبدوه ولا یشرکوا به شیئا)رواه البخاري. واتە:ئەی موعاز دەزانی ماڤی خوا لەسەر بەندەکانی چیە؟... ئەوەیە، کە بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن.

هۆکاری دووەم:ئەوەیە کە بە تەنها بەو دینە ژیانی مرۆڤ لە دونیا و قیامەتدا چاك و خۆش دەبێت. ئەگەر لە دونیادا خوای حەق نەپەرستێت، ئەوا جگە لەو پەرستراوی تر دەپەرستێ، کە لە ڕاستیدا ماڤی خوایەتیان نیەو، کت و مت بەم جۆرەی، کە پەروەردگار باسی کردووە، وای بەسەر دێت﴿ يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُوا۟ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ ۚ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴾ الحج: ١٢ - ١٣. واتە: هاناو هاوار لەکەسێك دەکەن لەجیاتی خوا، یاخود پەنا بۆ کەسێك دەبەن، کە نەزەرەر، نەقازانجی پێ دەگەیەنێت، ئەو حاڵەتە گومڕایی و سەرلێشێوایەکی زۆر نابەجێ و دوورە. (نەفامان هاناو هاوار لەکەسێك دەکەن)کە زەرەری زیاترو نزیکترە لە قازانجی، ئەی کە چەندە یارو یاوەرو هاودەمێکی نارەسەن و خراپیان هەیە.

ئەگەر دوای ڕێبازی خوایی نەکەوێت، کە خوای میهرەبان و شارەزاو دانا و زانا دایناوە، ئەوا دوای ئەو ڕێچکەو ڕێبازانە دەکەوێت، کە لە دەسکردی ئادەمیزادن، کە زانستەکەیان لەسنورێکی دیاریکراودا دەوەستێت و، پەی بەهەندێ شت دەبەن و هەندێکیشیان لێ ون دەبن، هەندێ جار

بەلای ڕاستیدا دەڕۆن، هەندێ جاریش هەواو ئارەزووییان بەسەریاندا زاڵ دەبێت، ئیتر لەڕێبازەکەیاندا چاکەو خراپە تێکەڵ دەبن و بە فەوتان و لەناوچوونیان کۆتایی دێت، هەرچەندە، کە ماوەیەکیش لەژێر سایەیدا خۆشی ببینن، بەڵام بەپێی ویستی خوا کورتی و کەمی و زۆری و بۆی هەر دەبێت!

بەڵام لەژیانی ئەو دونیادا(ئاخیرەت)، کارەکە زۆر مەترسیدارترە.. یان بەهەشت یان دۆزەخ. (بەهەشت)ێك، کە ئەوەی تیایدایە نەهیچ چاوێك بینیویەتی، نەهیچ گوێیەك بیستوویەتی، نەبەدڵی هیچ کەسێکدا هاتووە، ئـــاگرێکیش﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ النساء: ٥٦.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، لەئایندەدا بە ئاگری دۆزەخ دەیان سوتێنین، هەموو جارێك پێستیان داوەشاو سووتاو هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بەبەریاندا، بۆ ئەوەی بەچاکی سزاو ئازار بچێژن﴿ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴾ الشعراء: ٢٠٦ - ٢٠٧

واتە: باشە ئەگەر ساڵەها مۆڵەتیان بدەین و ژیانی دونیا بەخۆشی ببەنە سەر، باوەڕ دەهێنن؟!پاشان ئەگەر ئەو هەڕەشەو سزایەی کەلەوان کراوە هاتەدی و پێش هات دەتوانن چی بکەن؟!ئەوسا ئیتر ئەوڕابواردنەی دونیایان هیچ فریایان ناکەوێت و بێ سوود دەبێت﴿ أَفَمَن وَعَدۡنَٰهُ وَعۡدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعۡنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مِنَ

ٱلۡمُحۡضَرِینَ ﴾ القصص: ٦١ واتە: ئایا ئەو کەسەی بەڵێنێکی چاکمان داوەتێ و پێی دەگات، وەکو ئەو کەسە وایەهەر لەژیانی دونیادا کەمێك ڕابواردنی پێ ببەخشین؟پاشان لەدەرئەنجامی کارو کردەوەی ناپوختیدا لە ئامادە کراوان بێت بۆ لێپرسینەوەو ئاگری دۆزەخ؟

****

یەکێکی تر لەو شتانەی، کە ئیسلام جێگیر(ثابت)ی کردوون، پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزەکەیە، کە بەخێرایی ئاماژەیەکی بۆ دەکەین. ئیسلام ئەم پەیوەندییەی جێگیر کردووە، لە هەموو لایەکەوە بەجێگیرەکانی تریەوە بەستۆتەوەو کردوویەتی بەیەکێك لە کۆڵەگەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی.

هەروەکو چۆن بینیمان لە باسی ئایین(الدین)دا، بەمانای پەرستنی خوا بەبێ هاوبەشی بۆ بڕیاردان، کە ئیسلام لەجێگیرەکان دایناببوو، بەهۆی ئەوەی کەلەسەر چەند بنچینەیەك دامەزراوە کە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. لەم بابەتەشدا هەمان شێوە تێبینی دەکرێت، هەروەکو کە لەهەموو جێگیرەکانی تریشدا، کە ئیسلام جێگیری کردوون، ڕەنگ دەداتەوە.

پەیوەندی دوو ڕەگەزەکە جەخت لەسەر دوو لایەن دەکاتەوە، پیاوو ئافرەت لەلایەك و پەیوەندی سەرنج ڕاکێشی هەر یەکێکیان بۆ ئەوی دی لەلایەکی دی﴿ وَمِنۡ ءَایَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الروم: ٢١ واتە: یەکێك لەبەڵگەو نیشانەکانی تری ئەوەیە، کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا

خۆشەویستی و سـۆزو میهرەبـانی فەراهـەم هێنـاوە، بەڕاسـتی ئـا لـەو دیاردانـەدا نیشـانەو بەڵگـە هەیـە بـۆ کەسـانێك، کـە بیردەکەنـەوە و تێدەفکرن.

ئەم پەیوەندییە، بریتییە لە ئاڵ و گۆڕکردنی سۆز خۆشەویستی لە نێوان هـەردوو ڕەگەزەکـەداو، ئـارامی و ئۆخژنێکە، کـە هـەر کـام لـە دوو ڕەگەزەکە بە نزیك بوونیان لەلای ئەوی دی هەستی پێدەکەن.

بۆتێرکردنی ئەو پێویستییەی مرۆڤ و وەڵامدانەوەی ئـەو هێـزە فیتڕی و خوارسکەو، وەدیهێنانی لە واقیعدا، لەدوو ڕێیـان زیاترمـان لەبەردەمـدا نـین، ڕێگایـەك کـە پـەروەردگار دایـنـاوە و، حـەڵاڵی کـردووە و، هـەموو کاروبارێکی ڕێکخستووە و بۆ هەر ئەندامێکی، فرمان و ماف و ئەرکـەکانی دیاریکردوون و، ڕێگاکەی تریش ئەوەیە، کە پەروەردگار حەڕامی کردووە، بەهۆی ئەو فەسادی و خراپەکارییەی، کە لەسەر زەویدا دروستی دەکات.

مرۆڤ بەو شێوەیەی کە پەروەردگار درووستی کردووە-تەواو وتۆکمەیە. جەسـتەو عـەقڵ و گیـان، هـەموویان پەیوەسـتن بـە یەکـەوە و، هـیچ ئەنـدامێك لـەوی دی جیـا نابێتـەوە. هەرچـەندە کـە ئەمـە لـە ژیـانی ڕۆژانەیـدا هەنـدێ جـار پێچـەوانە خـۆی دەنـوێنێ، بـەوەی کـە لایـەنی جەستەی لە ساتێکدا و، لایەنی عەقڵی لـە ساتێك و، لایـەنی گیـان(روح)ی لەساتێکی تردا خۆی دەردەخات، بەڵام دەرکەوتنی لایەنێك لەلایەنەکان لە سـاتێکی دیـاریکراودا، ئـەو پەیوەندییـە بەردەوامـەی نێوانیـان هەڵناوەشێنێتەوەو، تۆکمەییان ڕەت ناکاتەوە.

ئـەو ڕێگایـەی کـە خـودا وێنـەی کێشاوەو، حـەڵاڵی کـردووە و هـەموو کاروبـارێکی ڕێکخسـتووە، ئـەو ڕێگایـەی کـە هـەموو لایەنـەکانی مـرۆڤ

دەگرێتەخۆ-تەواو و تۆکمە هەروەکو چۆن پەروەردگار درووستی کردووە-ئەگەر یەکێك لەلایەنەکان لەساتێکدا بەدیار کەوت ولایەنێکی تریش دەرکەوت، پەیوەندیە بەردەوامەکەی و تۆکمەییەکەی هەڵناوەشێنێتەوە.

هەموو ڕەگەزەکانی کیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەو ڕێیە هەن، کە پەروەردگار وێنەی کێشاوە و حەلاڵی کردووە:لایەنی جەستە و عەقڵ و گیان، کاتێك کە سەیری هاوسەرگیری(الزواج)دەکەین لەهەموو ڕووەکانەوە، ئەو ئەنجامە باشانەی، کە لێی پەیدا دەبن و، هەوڵدان بۆوەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی و، ڕێکخستنی ماڵ و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان و هەولی پەروەردەکردن و هەرەوەزی و، ڕووکردنە پەروەردگار.

بەلام ڕێگاکەی تر کە لە کتێبی خوا(قورئان) دراوەتە پاڵ شەیتان و شوێنکەوتوانی لەئەندازەی چەند دەنکۆڵە مروارییەکی پەرش و بڵاو زیاتر هیچ لەمرۆڤدا ناهێنێتەدی، سەرەڕای ئەو فەسادی و خراپەکارییەی، کە لە زەویدا بڵاوی دەکاتەوە.

****

ئەم دوو مەسەلەیەمان لەنێو زۆرمەسەلەی تر هەڵبژاردن، کەپەروەردگار لەکتێبەکەی(قورئان)دا ڕوونیکردوونەتەوە، چونکە نەفامیەتی نوێ زۆر زیادەڕۆیی و، فێڵ و تەڵەکەو ساختەبازی گەورەی تیایاندا کردووە!

هەروەها پێویستە، کە سەرنجێك بدەینە مێژووی ئەوروپا لەهەردوو نەفامیەتە یەك لەدوا یەکەکانی:نەفامیەتی سەردەمی کلێسا

لەسەردەمەکانی ناوەڕاستدا-سەدە تاریکەکان لەلای ئەوان-و نەفامیەتی بوژانەوەو، لەو کاتەوە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

من باش دەزانم، کە هەندێ خەڵك زۆر سەغڵەت و ناڕەحەت دەبن، کە ئەو پێشکەوتنە زانستی و ئابوری و سەربازی و سیاسییەی ئەوروپا تیایدا دەژی بە نەفامیەت(الجاهلیە)ناو دەبەم، بۆیە پێیان دەڵێم، کە ووشەی نەفامیەت(الجاهلیە)بە دەستەواژەی قورئانیی، هیچ پەیوەندی بەو لایەنانەوە نیەو، پەیوەست نیە بە پێشکەوتنی زانستی و ئابوری و سەربازی و سیاسی، بەڵکو پەیوەستە بە مەسەلەیەکی بنەڕەتی، کە پەیوەستە بە پەیوەندی مرۆڤ بە خوای پەروەردگاری-سبحانە و تعالی-وەشەرع و ڕێبازەکەیەوە، لەدەستەواژەی قورئانی پیرۆزدا-واتە نەزانی و نەفامی حەقیقەتی خوایەتی و شوێن نەکەوتن و نەگرتنەبەری ئەو ڕێبازەی، کە پەروەردگار ناردوویەتیە خوارێ، ئەمە هەرگیز ئەو مانایە ناگەیەنێت، کە نەفامەکان(الجاهلیین) زانست و شارستانیەت و پێشکەوتنیان نەبێت لە هەر بوارێکدا، بەڵکو لێیان دەپرسێ:ئایا ئەوان وەکو پێویست خودا دەپەرستن؟ ئایا ئەوان شوین ئەو ڕێبازە کەوتوون، کە خوا ناردوویەتیە خوارێ؟ئەگەر وەڵامەکە بە نەرێ(نا)بوو ئەوا ئەوان نەفامن و لەسەردەمی نەفامییەتیدا دەژین، هەرچەندە گەیشتبێتنە ئەوپەڕی زانستە زەمینییەکان و شارستانیەتی ماددیشەوە.

خوای پەروەردگار-سبحانە وتعالی-لەم بارەیەوە دەفەرموێت﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ

﴿ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ۝٩ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ۝١٠ ﴾

**الروم: ٩ - ١٠. واتە: ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشای بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەواندا هێناوە؟لەمان زۆر بەهێزترو دەسەلأتدارتربوون، زەویان ژێرەو ژوور دەکرد(واتە دەیانکێلا بۆ کشتوکاڵ و کانزایان لێ دەردەهێنا)و، ئاوەدانیان کردبۆوە زیاتر لەمان، پێغەمبەرانیشیان کاتی خۆی بەلگەی زۆر و ئاشکرایان بۆ هێنا ؟(بەلأم بێ سوود بوو زۆربەیان بڕوایان نەکرد)جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد. پاشان ئەو تیاچوونە سەرئەنجامی ئەوانە بوو، کە تاوان و گوناهیان کرد، چونکە ئەوانە بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی خوا نەهێنا و گاڵتەیان پێدەکرد**

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ۝٨٢ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ۝٨٣ ﴾ **غافر: ٨٢ - ٨٣. واتە:ئایا ئەوە بە زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشا بکەن چیمان بەسەر قەوم و خەڵکانی پێش ئەماندا هێناوە و سەرئەنجامیان چۆن بووە؟ئەوان زۆر لەمان زیاتر بوون و هێزیان لەمان زۆرتر بوو، شوێنەواریان لە زەویدا ئاشکراتر بوو، بێگومان ئەو کار و کردەوەی، کە دەیانکرد هیچ فریایان نەکەوت و ڕزگاری نەکردن. جا کاتێك پێغەمبەرەکانیان بە بەلگەو نیشانەی تەواوەوە بۆیان**

ڕەوانە کران، لەجیاتی ئەوەی باوەڕیان پێبهێنن خۆیان دڵخۆشکرد بەو ڕادە کەمەی کە لە زانست وزانیاری هەیانبوو، سەرەنجام هەڕەشەی خوا لەسەر زاری پێغەمبەراندا یەخەی پێگرتن و ئەوەی، کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد دەستەویەخەیان بوو، فەوتاندنی.

جا کە مەسەلەکە ڕوون بووەوە و، دەرکەوت کە، ناونانی نەفامییەتی نوێ هیچ وەدرۆخستنەوە و، بەهەند هەڵنەگرتنی ئەو پێشکەوتنە زانستی و سەربازی و ئابووری و سیاسی ناگرێتەوە، با بگەڕێینەوە بۆ هەندێ ڕاستی مێژوویی.

ئەو ماوەیەی، کە کڵێسای ئەوروپی دەستی بەسەر هەموو کارەکاندا گرتبوو، لەسەردەمێکی پڕ لە ستەم و تاریکیدا، کە لێرەدا بواری خستنەڕوویمان نیە، تەنها ئەوە بەسە، کە لە سەرچاوەکانی خۆیاندا لەم بارەیەوە باسکراوە، کە دە سەدەی تەواوی داگیر کردووە لە مێژووی ئەوروپادا، بەتایبەتی ئەوەی سەرچاوەکان دەربارەی دادگاکانی پشکنین(محاكم التفتيش)دا باسیان کردووە، کە لە خراپترین ئەو کارانەیە، کە لەو ماوەیەدا ڕوویداوە. بەڵام ئەوەندە بەسە کە ناوی بنێین نەفامییەت(الجاهلیه) بەهۆی هۆکارێکی بنەڕەتی، کە ئەویش ئەم ستەم و تاریکیەیە، پێویستە ئەوەش بزانین، کە ئەو یاسایانەی پەیڕەو دەکران ئەوانە نەبوون، کە لە ئایینی خوایی نێردراو بۆ عیسا-علیه السلام-دا هاتبوون، بەڵکو حوکمی پیاوانی ئایین(رجال الدين) بوون، کە لەسەر دینە خواییەکەو ڕێگا ڕاستەکە لایاندابوو، هەر ئەوانیش بوون، کە (ئایین)یان کردبووە دێو(خێو)ێکی مەترسیدار، کە بەدوای خەڵکەوەیە و، لە خەو و بێداریدا دەیانترسێنێت و، ماڵ و سامانیان بەتاڵان دەبات و

خۆشـگوزەرانییان لێـدەرفێنێت و، دەرگـای زانسـت و زانیارییـان بـەڕوودا دادەخات و ملکەچی چەندین جۆری زوڵـم و سـتەمی  ڕۆحـی و عـەقڵی و سیاسـییان دەکـات، هـەروەها هـەر بەزینـدوویی دەیانخاتـە ئـاگرەوە، تـەنها بەهۆی گومان هەبوون لە دۆستایەتییان بۆ کڵێسا!

ئـەم بارودۆخـە بـووە هـۆی ڕوودانـی ئـەو ڕاپەڕینـە گەورەیـەی، کـە لـە ئەوروپادا ڕوویدا، ئەو ڕاپەڕینـەی، کـە باروودۆخەکـەی لـە (دژ)ەوە گـۆڕی بۆ(دژ). پیاوانی ئایین(رجال الدین)، ئایینیان گۆڕی بۆ ئایینێك، کـە تـەنها گرنگی بەدواڕۆژ بدات و، پەیوەندی بە ژیانی دونیـاوە نـەمێنێت و، مـرۆڤ بچووك بکاتەوە کە خوا بە گەورە بزانێ، جەسـتە بچووك بکاتـەوەو، ڕۆح گەورە بکات، ڕاپەڕینەکەش مانای ئایینی گۆڕی بۆ-ڕێبازی ژیـان-کـە تـەنها گرنگـی بـەژیانی دونیـا بـدات و دواڕۆژ پشـت گـوێ بخـات و، مـرۆڤ بەسەرخوادا گەورە بکات و، جەستە گەورە بکات بەسەر ڕۆحدا.

ئیتر جولەکـەکان ئەمـەیان بەهـەل زانـی بـۆ تۆڵەسـەندنەوە لـە ئـایینی کڵێسا، کە ئەمانی دەچەوساندەوە، بۆیە پلانیـان دانـا بـۆ لـەناوبردنی ئـەو دینە لەڕوی بیروبـاوەڕو ڕەفتـارەوە، ئـەویش بـە وورووژانـدنی ئارزووەکـانی مـــرۆڤ بـــۆ بـــەدیهێنان و جێبـــەجێکردنی پلانەکـــەیان، کـــە کتـــێبی (تلمود)ەکەیانشیکردنەوەی بۆ کردووە و، گرنگترین بەنـدەکانی  بریتین لە فەسادی بیروباوەڕو تێکـدانی ڕەووشـت، پێشـڕەوانی جولەکـەش، مـارکس و فرۆیـد و دورکـایم، کـە هـەموو توانایـەکییان خسـتەکار و، بـە هـەموو بیرۆکەیـەکی شـەیتانی کاریـان بـۆ ڕوخانـدنی ئـەم دوو کۆڵەگەیـە:

ئایین(الدین) و، ڕەووشت(الاخلاق)[1] دەکرد.

سەبارەت بە ئایین مارکس گوتوویەتی:ئایین تلیاکی گەلانە (الدین افیون الشعوب)، فرۆید-یش گوتوویەتی:خواپەرستی و ئایین لەئەنجامی غەریزەی جینسییەوە پەیدادەبێت! (دۆرکایم)یش، لە کتێبی-سەرەتایەك لە زانستی کۆمەڵناسیدا- لەنیوە دێرێکدا هەموو کلتووری مرۆڤایەتی ڕەت کردووەتەوە و، گوتوویەتی:هەندێ کەس گوتوویانە، کە گەشەسەندنی ئایین و هاوسەرگیری و خێزان بەشێکن لە فیترەت، بەڵام مێژوو پێمان دەڵێت، کە ئەم بیروباوەڕ و خواستانە بەشێك نین لە فیترەت و ئەسڵی مرۆڤ!!

سەبارەت بە ئەخلاقیش مارکس پێیوابووە، کە هەردەم ڕەنگدانەوەی بارووردۆخی ئابووریە لە
کات و ساتێکی دیاریکراو دا، بۆیە هەمیشە لەگەڵ بارودۆخە جیاوازەکاندا دەگۆڕێت، لەبیریشی نەچووە بڵێت، کە پاراستنی داوێن لە خراپە و، پاك ڕاگرتنی لە ڕەووشتی کۆمەڵگە کشتووکاڵییە دواکەوتووەکانە و، ئازادی جینسی(الحریة الجنسیة)ش لە ڕەووشتی کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکانە!

فرۆید-یش ڕەووشتی بە هەندێ هەستی دامرکێنەرەوە وەسف کردووە، کە مرۆڤ تووشی گرێی دەروونی و هەڵکشان و داکشان و دەمارگیری دەکەن و، هیچ چارەسەرێکیشی نیە جگە لە لابردنی ئەو دامرکاندنەوەو کپ

---

[1] )ئەگەر بتەوێ بەدرێژی ئەم بابەتە بخوێنیتەوە، ئەوا سەرنجی کتێبی(مذاهب فکریة معاصرة)لە ژێر ناونیشانی (دور الیهود فی افساد اوروبا)بدە.

کردنــەوە لەســەر پاڵنــەری جینســی و، ڕەخســاندنی ئــازادی تــەواو بــۆی.
(دۆرکایم)یش هەروەکو پێشتر باسمـان کـرد، کـە گوتوویـەتی:هاوسـەرگیری
(الزواج) لە فیترەت و پاکی نیە!کەواتـە ڕێگاکـەی تـر لای ئـەو پاکییـە!کە
پەیوەندییە ئازادییە جینسییەکانن بەبێ هیچ بەندوبارێك!!

ئابـەم جـۆرە ڕۆڵـی نـەفامی نـوێ(الجاهلیـة المعاصـرة)لـە دوو مەسـەلەدا
خۆی دەنوێنێت:ئایین و پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزەکە، لـە کاتێکدا، کە
ڕێبازی خوایی لـە نـەگۆڕەکان(ثوابـت)دا دایـناون، کەچـی نـەفامی نـوێ لـە
گۆڕاوەکـان(المـتغیرات)دا دایانـدەنێت، بـەم شـێوەیە جوولەکـەکان ئـەوەی
ویستیان لە فەسادی و خراپەکاری وەدەستیان هێنا!

****

مرۆڤی موسوڵمان کاتێك، کە پەیڕەوی لە ڕێبـازی خـوایی دەکـات، هـیچ
کێشەیەکی بەرانبەر بە نەگۆڕ و گۆڕاو(الثابت والمتغیر)نیە، چونکە ئـەوەی
کە پەروەردگار ئـەمری بـە نـەگۆڕکردنی کـردووە، ئـەو جێگیری دەکات و
دەیچەسپێنێ و نـایگۆڕێ، کۆشـش(اجتهاد)ێکـی فـراوانیش لـە گۆڕاوەکانـدا
دەکات، بـەجۆرێك کـە هـیچ حـەرامێك حـەلاڵ ناکـات و هـیچ حـەلاڵێکیش
حەرام ناکات، لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا تێك ناگیرێت.

کێشە لە عەقڵی ئەوروپییەکان، لە کات و ساتێکی دیاریکراودا درووست
بوو. چونکە لەسـەردەمی کلێسـادا ڕێبـازی جێگیری و نـەگۆڕی بـڵاو بـوو..
نەگۆڕی لە هـەموو شـتێکدا، چ ئەوشـتەی خـوا ئـەمری بـە جـێگیر کردنـی
کردبێـت، یـان کلێسـا لـەلای خـۆی جـێگیری کردبێـت. هـەتا ڕژێمـی
دەرەبەگایەتی بە هەموو ئابڕۆچونەکانیەوە و، ڕەتکردنـەوەی گـەورەیی و
کەرامەتی مرۆڤ و، هەروەها تیۆرە زانستییە هەڵەکان وەکو ڕەتکردنـەوەی

خڕیی زەوی و، چەقی گەردوون. دوای ئەوەی ڕاپەڕین ڕوویدا، کە وەکو ڕەتدانەوەیەك بوو بۆ ستەم و زۆرداربیەکانی کڵێسا و پیاوانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی، بیرۆکەی جێگیری ڕەتکرایەوەو، بیرۆکەی گۆڕانی بەردەوام(التغير الدائم) جێگای گرتەوە، کە ڕێ بە نەگۆڕی هیچ شتێك نادات، بیردۆزی داروین پاڵنەرێکی گەورە بوو بۆ ئەم ئاراستەیەو، پێشڕەوانی جوولەکەش هەوڵی خۆیاندا لە بەکارهێنانی بیردۆزی (گەشەسەندن)ی داروین، بۆ ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو شتانەی، کە پێشتر خەڵك بە نەگۆڕیان دەزانین، بەتایبەتی ئایین(الدین)و، ڕەووشت(الاخلاق).

لە هەردوو باریشدا ئەوروپا لەسەر ڕێی ڕاست نەبوو!

چونکە ئەو کاتەی، کە هەموو شتێکی جێگیر کرد-هەتا ئەو شتانەش، کە پێویست نەبوو بگۆڕدرێن-ژیانی ووشك و ڕەق و ناخۆش کرد، بەتایبەتی کاتێك، کە هەندێك شتی جێگیر کرد کە تێکدەرو خراپەکاربوون و، هەر نەدەبوو، کە درووست ببن، وەکو سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئیتر ئەمە بووە هۆی ئەوەی، کە سەرچاوەکانی خۆیان بە —سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست —ناوی ببەن.

هەروەها کاتێك، کە نەگۆڕەکانیان ڕەتکردەوە -تا کار گەیشت ڕەتکردنەوەی ئایین و ڕەووشت، کە خوا ئەمری بە جێگیر کردنیان کردبوو- بووە هۆی ئەوەی، کە نەفامی نوێ (الجاهلية المعاصرة)، پەیڕەوی هەموو جۆرەکانی فەسادی و خراپەکاری بکات و، وای لە ئەوڕوپا کرد، کە هەست بە هەڵەکانی بارودۆخی ئەمڕۆ نەکات.

له سەدە سەرەتاییەکاندا-سەدە تاریکەکانی ناوەڕاستی لای ئەوان-جۆرە دواکەوتووییەك لە هەموو لایەنەکاندا هەبوو. جا کاتێ ئەوروپا پەیوەندی بە جیهانی ئیسلامییەوە کرد لە هەرسێ دەلاقە ناسراوەکانی مێژوو:جەنگەکانی خاچپەرستان و، پەیوەندییە بازرگانییەکان و، تێکەڵ بوون لەگەڵ شارستانییەتی ئیسلامی لە (ئەندەلوس)و وەرگێڕانی زانستە ئیسلامییەکان بۆلاتینی و ئیغریقی، ئیتر دوای ئەمە خەڵك هەستیان بەو تاریکیەکرد، کە تیایدا بوون و، بڕیاری ئەوەیاندا، کە لێی بێنە دەرەوەو خۆیانی لێ ڕزگار بکەن و بەرەو ڕووناکی هەنگاو بنێن. ئەم جارەیان پێشکەوتنێکی زانستی گەورە درووست بوو، دەوڵەمەندییەکی گەورەی ئابووری دەبینراو، هێزێکی سەربازی و دەسەلاتێکی سیاسی بەرچاوی خەڵکی گرت، ئیتر پەڵە ڕەشەکانی شارستانییەتەکەیان نەدەدیت . لەوەش خراپتر ئەوەبوو، کە جێگرەوە(بدیل)ە ئیسلامییەکە، کە نەگۆڕەکان جێگیر دەکات و لە گۆڕاوەکانیشدا کۆشش(اجتهاد)دەکات و، بە جێگیرەکانی دەبەستێتەوە، ئامادە نەبوو لە گۆڕەپاندا، بەهۆی ئەو دواکەوتوویەی، کە ئوممەت لەو کاتەدا تێی کەوتبوو، بەهۆی لادان و پەیڕەوی نەکردنی ڕێبازی خوایی، ئیتر ئەوروپا لایەنێکی بەپشتەوە نەما تا هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە، هەروەکو چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕوویدا-بەڵکو ئەوروپا توانی بەهۆی دەسەلاتی بەسەر موسوڵمانانندا و، گۆڕانێکی بەدو پیس دەست بەسەر نەگۆڕ(الثبات)دا بگرێت !ئیتر وای لێهات ئەوانەی، کە خۆیان بە ڕۆشنبیر(مثقف) دادەنا، بانگەوازی پەیڕەو کردنی گۆڕانیان دەکرد، ئەو گۆڕانەی، کە گۆڕانکاری لە هەموو ئەو شتانەدا دەکات، کە خوا ئەمری بە دەست لێنەدان و نەگۆڕانیان کردووە، ئەوان ئیددیعای ئەوەیان

دەكرد، كە جگە لەم ڕێگایە، ڕێگای تر نییە بۆ ڕزگاركردنی ئوممەت لەو بێ هێزییەی كە تێی كەوتووە.

****

خراپی و بەدی لە نەفامی نوێ، ئەوەیە كە لە جیاتی خوا خودی مرۆڤ دەكرێتە خوا و دەپەرسترێ، تێی كەوتبوو، بەجۆرێك، كە هەر مرۆڤە پێوانەكان دادەنێت و، هەر مرۆڤە یاساو ڕێساكان و شەریعەت دادەنێت، هەر مرۆڤە كە بڕیاری ڕەوابوون و ڕەوانەبوونی شتێك دەدات.

سەرنجی قسەكانی جولیان هیكسلی-بێ باوەڕێكی ئەو سەردەمە-بدە كە لە كتێبەكەیدا(مرۆڤ لە جیهانی نوێدا ) دەڵێت:مرۆڤ لە ڕابردوودا، كە ملكەچی خوا بوو، بەهۆی بێ توانایی و نەزانی بوو، بەڵام ئێستا كە فێر بووەو، دەستی بەسەر ژینگەدا گرتووە، كاتی ئەوە هاتووە، كە ئەوەی بۆلای خوای دەگێڕایەوە لە سەردەمی بێ توانایی و نەزانیدا بیخاتە كۆڵی خۆی و، خۆی ببێتە خوا!!).

ئاشكرایە كە هەموو مرۆڤێكی ڕۆژئاوایی وەكو جولیان هیكسلی نین، بەڵكو زۆر كەسی دینداری تێدا هەن، بەڵكو هۆشیارییەكی گەورە هەیە لە ڕۆژئاوادا، بەهۆی ئەو هەواڵەی، كە پێیان دەڵێت مەسیح لە هەزارەی سێیەمدا دێتە خوارەوە . بەڵام ئایین لە دیدی ئەم دیندارانەوە چییە؟ پەیوەندی نێوان بەندەو خوا لای ئەوان لە نێو دڵدایەو، هیچ پەیوەندییەكی بە واقیعی ژیانەوە نییە!.

ئایانەو دینەیە، كە خوا ناردوویەتیە خوارێ بۆ ئەوەی حوكمی واقیعی ژیانی پێبكات، كە دەربارەی فەرموویەتی﴿ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ

ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ المائـــدة: ٤٧.
واتـــه:دەبـــا شـــوێنكەوتوانی ئینجیـــل بـــەو ڕێنمـــوویی و ئامۆژگاریانـــە هەڵسوكەوت بكەن، كـە خـوا لـە ئینجیلدا دایبەزانـدوون، ئـەوەی حـوكم و داوەری نـەكات بەو بەرنامەیەی، كە خوا دایبەزاندووە، ئـا ئەوانـە ناپـاك و تاوانبار و لە سنوور دەرچوون. هەروەها دەربارەیـەوە فەرموویـەتی﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴾ المائدة: ٤٩. واتـه: حوكم بكە بـەو بەرنامەیـە(قورئانـە)ی كە لەلایـەن خـواوە بـۆت دابـەزیوە، شوێنی ئارەزووەكـانی ئـەوان مەكـەوە، وورِیابـــە نـــەوەكو ئـــەوان ڕێـــت لـــێ هەڵـــە بكـــەن، لـــە هەنـــدێك لـــەو ڕێنموویيانەی، كە خوا بـۆی ناردوویـت. هـەروەها فەرموویـەتی:﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴾ المائـــدة: ٥٠. واتـــه: ئایـــا ئەوانە حوكم و فەرمانڕەوایی جاهیلییـەت و نـەفامییان دەوێـت و ئـەویان لاپەسەندە؟!(ئاخر بۆ بیر ناكەنـەوە)كـەس هەیـە بەقـەدەر خـوا حـوكمی جوان و چاك و بەجێ بێت، بە تایبەت لای ئەوكەسـانەی، كە بـە ووردیـی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە؟

نەخێر .. بە دڵنیاییەوە!

# دادگەری سیاسیی لە ئیسلامدا

دادگەری سیاسی لە ئیسلامدا لەسەر چەند کۆڵەگەیەك وەستاوە، کە گەورەترین و بەهێزترین کۆڵەگە، ڕێگری کردنە لە مرۆڤ کە شەریعەت بۆ ژیان دابڕێژێت و، یاسادانان تەنها مافی خوایە.

ئاشکرایە ئەم چەمکە و تێگەیشتنە، ڕاستەوخۆ لەگەڵ دیموکراسی تێکدەگیرێت، ئەو دیموکراسییەی، کە زۆر خەڵك-لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا — وا تێدەگەن، کە دادگەرترین سیستەمە، کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو ناسیویەتی. یەکێك لەو دروشمانەی دیموکراسی جاڕی بۆ دەدات-دواتر ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە تا چەند لە جێبەجێکردنی دروشمەکانی لە واقیعدا ڕاستگۆیە-ئەوەیە، کە میللەت سەرچاوەی دەسەڵاتە.

دیموکراسی، ئوممەت-واتە مرۆڤ- لە دوولاوە دەکاتە سەرچاوەی دەسەڵات: لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەواو، دانانی ئەو یاسا و ڕێسایانەی، کە فەرمانڕەواو ژێر فەرمانەکان پێیەوە پەیوەست دەبن، لە کاتێکدا کە ئیسلام هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا دەخاتە دەستی ئوممەت، بەڵام یاسادانان بە مافی خوای پەروەردگار دەزانێت، کە وەدیهێنەری مرۆڤ و ئاسمانەکان و زەوییەو، لەسەر فەرمانڕەواو ژێر فەرمانەکانی پێویست دەکات، دوای ئە یاسایانە بکەون، کە خوای پەروەردگار ناردوونیەتە خوارێ و بەڕاشکاوی دەری خستووە، کە هەرکەسێك حوکم بەو یاسایانە نەکات، کە پەروەردگار

داینـاون، ئـەوا ئـەو کەسـانە لـە کۆمـەڵی کافران و ستەمکاران و لەسنوور دەرچووانن، خوای پەروەردگار ئەم سێ سیفاتەی بـۆ ئـەو کەسانە دانـاون، کە حوکم بەوە ناکەن، کە پەروەردگار ناردوویەتیە خوارێ و، هەرکام لەم سێ سیفاتانە کۆمەڵێك بەبێ کۆمەڵێکی تر ناگرێتەوە.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ

مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ المائدة:٤٤-٥٠

واتە: بەڕاستی کاتێك ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە ڕێنموویی تیادابوو (بۆ هەموو خێر و چاکەیەك)، نوور و ڕووناکیش بوو(لەناو تاریکیەکاندا)، ئەو پێغەمبەرانەی، کە هەمیشە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی ئەوەیان پێدەکرد کە ببونە جوولەکە، هەروەها زانا خوا ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان، حوکمیان دەکرد بەوەی داوایان لێکرابوو بیپارێزن، کە ئەویش کتێبی خوا تەوراتە، هەروەها شایەتیش بوون لەسەری(کەواتە ئەی زانایانی جوولەکە، ئەی ئیمانداران)، لەخەڵکی مەترسن، بەڵکو تەنها لەمن بترسن، ئایەت و فەرمانەکانی من بە نرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر نرخەکە هەموو دونیاش بێت هەرکەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات، کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن. لە تەوراتدا پێویستمان کردووە لەسەریان کە بەڕاستی هەرکەسێك کەسێك بکوژێت، دەبێ بکوژرێتەوە و چاوی یەکێك کوێر بکات، دەبێت چاوی کوێر بکرێتەوە و، لووتی یەکێك عەیبدار بکات، دەبێت لووتی عەیبدار بکرێتەوەو، گوێی یەکێك ببڕێت، دەبێت گوێی ببڕدرێتەوەو، ددانی یەکێك بشکێنێت، دەبێت ددانی بشکێنرێتەوەو، برین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەنرێتەوە، جا ئەوەی لە تاوانبار خۆش بێت، ئەو چاوپۆشین و لێخۆشبوونە، دەبێتە

کـەفارەتی گوناهـانی، بێگومـان ئـەوەی حـوکم و داوەری نـەکات، بـەو بەرنامەیەی، کە خوا دایبەزانـدووە، ئائەوانـە ستەمکارن. ئینجا بەشوێن ئاسەواری نەوەکانی ئیسرائیلدا عیسای کوڕی مەریەممان هێنـا، کە ڕاستی تـەوراتی دەردەخسـت و پشـتیوانی لێـدەکرد و ئینجیلیشـمان پێـدا، کـە هیدایەت و نـوور و ڕوونـاکی تێدایـەو پشتگیری تـەوراتی پـێش خۆیـەتی، هیدایەت و ڕێنمووبی و ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەی، کە لەخوا دەترسن و پارێزکـارن. دەبـا شـوێنکەوتوانی ئینجیـل هەڵسـوکەوت بکـەن بـەو ڕێنمـووبی و ئامۆژگاریانـە، کـە لـە ئینجیلـدا دایبەزانـدووە، جا ئەوانـەی ناپاك و لە سنوور دەرچون، قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هـەموو حەقیقـەت و ڕاسـتییەکدا بۆتـۆ دابەزانـدووە، ڕاسـتی و درووسـتی کتێبـەکانی پـێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەرهەموویاندا (کاتێك کـە خاوەنـانی کتێب لە گاور و، جوو گیرو گرفتیان دێنن بۆلای تۆ)بەو بەرنامەیـەی خـوا ناردوویـەتی داوەریـی بکـە لـە نێوانیانـدا و شـوێن ئارەزووەکـانی ئـەوان مەکـەوە و لـەو حەقـە لامـەدە، کـە بـۆت ڕەوانـە کـراوە، بـۆ هـەر لایەکتان(موسوڵمانان و خاوەنـانی کتێب)بەرنامـەو پرۆگرامـی تایبـەتمان بڕیـار داوە، خـۆ ئەگـەر خـوا بیویسـتایە هـەر هـەمووتانی دەکـردە یـەك ئوممەت و گەلێکی یەك پارچە، بەڵام ویستی وایە بەو جیاوازییە تاقیتـان بکاتـەوە لـەوەی پێـی بەخشیون(تـا بـەهۆی عـەقڵ و ژیریتانـەوە شوێنی پێغەمبەری ئیسلام بکەون)، دەی کەواتە زۆر بەپەلەبن و پێشبڕکێ بکـەن بۆ هەموو خێروچاکەیەك، دڵنیاش بن، کە هەمووتان دەگەڕێنـەوە بۆلای خوا، ئەوکاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ، دەربارەی ئەوشتانەی، کە کێشـەتان لەسـەری هـەبوو. کاتێـك هەنـدێك لـە زاناکـانی جووهـاتن بـۆ لات تـا

دادوەریی بکەی لە نێوانیاندا، داوەریی بکە بەو بەرنامەیە(قورئانە)ی، کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیوە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن، لە هەندێك لەو ڕێنموییانەی، کە خوا بۆی ناردوویت (جا ئەگەر ئەو جوولەکانە ڕازیی نەبوون)و پشتیان هەلکرد، ئەوە بزانە بەڕاستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێك لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن. ئایا ئەوانە حوکمی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟!(ئاخر بۆ بیر ناکەنەوە)، کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت؟بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بە وردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

لەم ئایەتە موحکەمانەی سەرەوەدا، بەڕاشکاوی دیارە، کە ئەو سێ وەسفانەی تێیاندا هاتوون (الکافرون، الظالمون، الفاسقون)، بەپلەی یەکەم و بەبێ جیاوازی، بۆ ئەو کەسانەن، کە حوکم بەو بەرنامەیە ناکەن، کە خوا ناردوویەتیە خوارێ. چونکە (مَن) لە زمانی عارەبیدا واتای گشتی(العموم)دەگەیەنێ، واتا هەرکەسێك کە کارێکی دیاریکراوی کردبێت، یان سیفەتێکی دیاریکراوی تێدا هەبێت. هەروەها هەرکام لە سێ وەسفەکان دەربارەی یەك کۆمەڵە هاتوون، کە بەهەمان کار هەڵدەستن، کە ئەویش حوکم نەکردنە بەو بەرنامەیەی کە خوا ناردوویەتیە خوارێ، ئەوانیش جوولەکەکانن. ڕەوا نییە بڵێین، کە کۆمەڵێکی دیاریکراو بە هەمان کار هەڵبستن، کەچی هەندێ جار لە کافران بن و، هەندێ جار لە ستەمکاران و، هەندێ جاریش لە سنوور دەرچووان!هەروەك چۆن هەندێ کەس، کە مانای ئەم ئایەتانەیان لێکداونەتەوە و، پشتیان بە گوتەی ئیبن

و عەبباس(ڕەزای خوایان لەسەربێت)بەستووە، کە گوتوویەتی (کفـر دون کفر). واتە:کارەکە کوفرە بەلاّم بکەرەکەی کافر نابێت!

ئـەوەی ئـەم ئایەتانـە ئاماژەی پێدەکـەن بریتییـە لـە ڕوو وەرگێـڕان و لادان لە شەریعەتی خواو، پەیڕەو کردنی بەرنامەکانی مرۆڤ لـە جێگایـدا، کە ئەمەش لەهەموو باراندا کوفرە، ستەمە، لە سنوور دەرچوونە . بـەلاّم ئەوەی، کە ئیبن و عەبباس(ڕەزای خوایان لەسەربێت) ئاماژەی بۆ کردووە (کفـر دون کفـر)، شتێکی جیایـە، بـە واتـای چەسپاندنی شـەریعەتی خـوا لەگەڵ هەندێ خوارکردنەوە لە جێبەجێکردنیدا، لەبەر هەر هۆکارێك لە هۆکارەکـان. کاتێـك تـەتارەکان حوکمیـان بـە (یاسـق) کـرد، لـەجیاتی شەریعەتی خوا، زانایان کۆڕا بوون لەسەر ئەوەی، کە ئەم کارەیـان کـوفرەو دەرچوونە لە چوارچێوەی میللەتی ئیسلام، بۆیە ئەمە ناچێتە ژێر سایەی گوتەکەی ئیبنوعەبباس(ڕەزای خوایان لەسەربێت).

لەم ئایەتانەدا بەڕوونی دیارە، کە پەروەردگار دوو حوکمی داناون، کە سێیەمیان نییە:یان حوکمی خوا، یان حوکمی نەفامیەت، پاشـان پـەیڕەوی کردنی حوکمی نەفامیەتی لەجیاتی حوکمی خوا قەدەغە کردووە.

جا بۆیـە دەڵێین دیموکڕاسی-کـە حـوکمی نەفامییەتـە بەدەسـتەواژەی قورئانی پیرۆز، چونکە حوکم بـە غـەیری حـوکمی خـوا دەکـات و حـوکمی خوا ڕەتدەکاتەوە-کۆمەڵێك شتی باشی تێدا هەن بۆ ئەو گەلانـەی لەلایـەن هەنـدێ پاشـاو فـەرمانڕەوای ئـەوروپا لـە سـەدە تاریکـەکانی ناوەڕاسـتدا، حوکمی خوایەتی پیرۆزیان تێدا پەیڕەو دەکرا، کە هەموو ئەو فەرمانانەی لەسەری پێویست دەکران جێبەجێیاندەکردن و لە هەموو مافێك بێبـەش دەکـران، دیموکراسـی بـۆ ئـەو گەلـە ژێـر دەسـتانە زۆر لـە مافـەکانیانی

گێڕایەوەو، لە ماددیەت دەری هێنان بۆ ئادەمییەت.

هەروەها دەڵێین کە دیموکراسی بۆ موسوڵمانانیش باشتر و دادگەرترە، لەو حوکمە ستەم و زوڵمەی، کە ئوممەتی ئیسلام لەچەند ماوەیەکی مێژوو و لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەسایەی ئەو حکومەتە سەربازییە ستەمکارانەدا تووشی بووە.

ئەوەی سەرنجی بۆ ڕادەکێشین و لە بارەی دەدوێین و دەڵێین، ئیسلام دادگەرترین سیستەمە-وەك كە خوا ناردوویەتی-کە مرۆڤ پیادەی کردووە، بەو جۆرەی کە خوا ناردوویەتیە خوارێ، نەك بەو جۆرەی، کە هەندێ نەوەی ئوممەتی ئیسلام پەیڕەویان کردووە، بەڵکو بەو شێوە ڕاست و دروستەی، کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا پەیڕەو کرا، ئیسلام بەو جۆرە ڕاست و دروستەی، کە خوا ناردوویەتییە خوارێ بەڵگەیە بەسەر ئوممەت و، ئوممەت لە هیچ کات و ساتێکدا بیانوو بەڵگە نیە بەسەر ئیسلامدا، ئەگەر ئوممەت بەڕاست و دروستی پەیڕەوی کرد ئەوا لەسەر ئەمری خوا پەیڕەو کراوە، بەڵام ئەگەر ئوممەت لێی لادا، ئەوا لە ئەمری خوا لایداوە و، ئایین هەروەکو خۆی، کە خوا ناردوویەتی دەمێنێتەوە و، هیچ گۆڕانکاری و کەمکردن و زیادکردنی بەسەردا نایەت و، هەربەو نیعمەتە دەناسرێت، کە خوا بەسەر خەڵکدا باراندوویەتی﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينًا ﴾ المائدة: ٣. واتە :ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاند و، نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و، ڕازیم بەوەی، کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو ئایینتان.

****

هەروەکو پێشتر باسمان کرد، دیموکراسی هەندێ لایەنی باش و بەجێی هەن، کە لێرەدا پێویست بە خستنەڕوویان ناکات، ئەوەی پێویستە بیانخەینە بەرچاو لایەنە خراپەکانیەتی، کە ئەوانەی بانگەوازی بۆ دەکەن بێ ئاگان، چ لەلای یارانی بن یان ئەو موسوڵمانانەی، کە بە گوتە بریقەدارەکانی خەڵەتاون.

دیموکراسی شانۆگەرییەکی جوانە، کە دەبینی پیاوی سەرشەقام (رجل الشارع) حوکم دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی حوکم دەکات سەرمایەیە، کە هەموو بوارەکانی ژیانی بۆ وەگەڕخراون.

دەنگدەر لەو وولاتانەی، کە دیموکراسییان بە تەواوی تێدا پەیڕەو دەکرێت، سەربەخۆیی تەواوی هەیە لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکەی. هیچ کەس زۆری لێناکات، تا دەنگ بە کەسێکی دیاریکراو بدات، ڕێگای ئەوەشی لێناگرن کە دەنگ بەو کەسە بدات کە پێی چاکە.. هەروەها هیچ کەس بەهیچ جۆرێك هەوڵ نادات کە ویست و ئیرادەی تەزویر بکات، یاخود چالاکیەکانی دەنگدان بۆ لایەنێك لە لایەنەکان تەزویر بکرێن. ئیتر بەسەربەخۆییەکی تەواو دەنگی خۆی دەدات، لەکاتی دەنگدانیشدا هەست بە ئارامییەکی تەواو دەکات، نە پیاوانی پۆلیس لێی دەدەن، نە بۆسەی بۆ دەنێنەوە تا نەگاتە شوێنی دەنگدان و دەنگ بدات، یاخود کاغەزی دەنگدانەکەی تەزویر بکەن، دوای ئەوەی شوێنی دەنگدان جێدێڵێت، یاخود سندووقە ڕاستەقینەکان بخەنە ناو دەریا و سندووقی پڕ لە کارتی پڕ کراوە بە ئارەزووی فەرمانڕەوا لە جێگایدا دابنێن.

بەڵێ. بەڵام..

ئایا ئەو پاڵێوراوانە کێن کە –بە ئازادییەکی تەواو- یەکێکیان هەڵدەبژێری ؟ئایا لە ڕاستیدا خزمەتی کێ دەکەن؟!.

ڕاستی لەم دیوی ئەو شانۆگەرییە جوانە ئەوەیە، کە ئەوان-تەنها کەمێکیان نەبن –خزمەتی سەرمایەداری دەکەن و نوێنەرایەتی ئەوان دەکەن!

کاتێك کە دەنگدەر-بە ئازادی تەواو-پاڵێوراوی - أ - یان - ب - یان - جـ - یان - د - هەڵدەبژێری، بەلام پاڵێوراوی - أ - یان - ب - یان - جـ - یان - د - زۆربەیان نوێنەرایەتی دەسەلاتداری ڕاستەقینە دەکەن، کە سەرمایەدارەو، خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەو دەکەن!

بەلام ئەو کەمینە چاکەی، کە تێیاندا هەن، لەوانەیە کەسی وایان تێدابن، کە بەڕاستی خاوەن ویژدانن و، بۆ چاکەو خێر هەوڵ دەدەن و، ستەم و زۆرداری ڕەتدەکەنەوە. لە لایەنە چاکەکانی دیموکڕاسی ئەوەیە کە خەلکی بەئازادی، ئەوەی باوەڕیان پێی هەیە دەری دەبڕن، بەبێ ئەوەی دەرگای ڕاگەیاندنیان بەڕوودا دابخرێ و، هەرگیز فەرمانڕەوا(الحاكم)هەوڵی دەستگیر کردن و ڕاپێچ کردنی زیندانیان نادات، کاتێك ڕەخنەی لێدەگرن و، تاوانیان بۆ هەڵنابەستێ، تا بەهۆیانەوە بیانخەنە کۆت و ئەشکەنجەو زیندانەوە..

بەڵێ.. بەلام..

کێش وسەنگی ئەوانە چەندە، کاتێك لە دانیشتنەکاندا بەپێی زۆرینەی دەنگ بڕیارەکان دەربکرێن، بەبێ ڕەچاو کردنی جۆری دەنگەکە، کە دەنگی کەسی تێگەیشتوو و بیرمەند و دووربین، لەگەڵ دەنگی ئەوانەی بەڵێ دەکەن یەکسان بێت، کە حیزبەکەی چی ئەمری پێکرد

جێبەجێی دەکات و بۆ کام ئاراستە بیەوێ ئاراستەی دەکات. بەم جۆرە دەبنە دوو کۆمەڵە، کۆمەڵێکی لایەنگری پیشە ئاساو، کۆمەڵێکی ناڕازی و موعاریزی پیشە ئاسا، یەکەمیان لە ئەندامانی فەرمانڕەوان و هەرچی حکومەت بڕیاری لەسەربدات پەسەندی دەکەن، ئەوانی دیش ئەندامی حیزبەکانی ترن، کە لە هەڵبژاردندا سەرکەوتوو نەبوون ئیتر هەرچی حکومەت بڕیاری لەسەربدات ئەوان ناڕازین، مەگەر لەبەرژەوەندی سەرمایە بێت، ئەوا کۆڕا(اجماع)ی لەسەر دەکەن!! تەنها کەمینەیەك دەمێنێتەوە، کە ئازادی تەواوی هەیە لەوەی، کە دەیەوێت بیلێت، بەلام بێ ئەوەی، کە قسەکانیان هیچ سەنگێکیان هەبێت لەکاتی دەرکردنی بڕیار دا!!

هەروەها لەکاتی بڕیار دەرکردندا، حیساب بۆ ئەو دەنگانە دەکرێت، کە لەگەڵ بڕیارەکەدان و، بێ ئەوەی سەیری ناوەڕۆکی بڕیارەکە بکرێت، ئاخۆ چاکە یان خراپ و بێ کەڵکە. وەکو بڕیاری جەنگی ئێراق، کە خراپترین و پڕ زیانترین بڕیار بوو، تەنانەت بۆ خودی ئەمریکا خۆیشی، سەرەڕای ئەو تاوانە مرۆڤایەتیە خراپانەی، کە بەهۆیەوە کەوتنەوە و، خوێنی بێ تاوانان ڕژاو خانوو بەسەر خاوەنەکانیاندا ڕووخێنران و، ئێراق بەتەواوی کاولکرا، کە بڕیارەکەش بەزۆرینەی دەنگەکان پەسەند کرابوو، کە ڕێکخراوە سەرمایەداریە گەورەکان لەپشت ئەم شەڕەبوون، چ ئەوانەی، کە لەسەر پیشەسازی چەك دەژین، یان ئەوانەی، کە هەوڵی وەدەست خستنی نەوت دەدەن.

ئەمە لەلایەك..

لەلایەکی ترەوە با سەیری پیاوی سەرشەقام (رجل الشارع) بکەین، کە پرۆسەی هەڵبژاردن لە ڕۆژئاوادا پشتی پێ دەبەستێت و شادەماری دیموکراسییەلە ڕۆژئاوادا.

دیموکراسی سەرمایەداری چۆن ئەم کەسایەتیەی درووست کردووە، تا خزمەتی سەرمایەداری پێبکات؟

ئێمە باسی هەموو خەڵك ناکەین. چونکە لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا بیرمەندان(مفکرون) و، چاکسازان (مصلحون)و، خاوەنی لێکۆڵینەوەی قووڵ لە بوارەکانی سیاسی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، پەروەردەیی و، فێرکاری.. هەن. بەڵکو باسی پیاوی سەر شەقام دەکەین، واتە تاکێکی ئاسایی خەڵك. ئایا خواستەکانی چین؟یان ئەو ئاسۆیانەی بۆیان دەڕوانێ چین؟ئایا خاوەنی عەقیدەیەکە، کە وای لێبکات هەڵوێستێکی دیار و ئاشکرای لە ژیاندا هەبێت؟یاخود ئایا خاوەنی مەبدەئێکە، کە هەوڵ بۆ بڵاو کردنەوەو، چەسپاندنیان دەدات؟یاخود دیموکراسی سەرمایەداری لە قالبێکدا دایڕشتووە، کە خزمەتی مەرامەکانی بکات؟ یان مرۆڤێکە کە بەخۆشی دونیا سەرقاڵە و، هیچ بیر لە دواڕۆژی ناکاتەوە و، سەرقاڵە بە دابینکردنی زۆرترین ئەندازەی کەل و پەل و، ڕاکێشانی زۆرترین کڕیار؟

بەڵێ لەوانەیە، کە تەواو هۆشیار بێت بۆ ئەو مافە دەستوریانەی، کە ئەو ئەندازە کەل و پەلی بۆ تەرخان دەکەن، بەڵام ئایا هەڵوێستی لە کێشە مرۆڤایەتیە گەورەکاندا هەیە؟یاخود گرنگی بە مرۆڤ دەدات لە دەرەوەی بیری تەسکی خۆی، یاخود هەڵوێستی بەرانبەری بەپێی دۆستایەتیەتی بۆ هەمان حیزب، یاخود لە ڕێی هۆ کارەکانی ڕاگەیاندنەوە :واتە ئەو سەرمایە دارانەی، کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان بەدەستە؟

خالێكی تریش :

دیموكراسی لە ژیانی ڕۆژ ئاوادا بە سرووشتی خۆی گەشەی نەكرد، بەڵكو وەكو كاردانەوەیەك بوو دژی ئەو زوڵم و ستەمەی، كە دەستی بەسەر گەلاندا گرتبوو لەلایەن سەركردەكانیانەوە، وەكو پاشاو فەرمان ڕەواكانان، یان پیاوانی ئایین .

هەروەها وەكو هەموو كاردانەوەكانی تر، كە لە مێژوو ڕوودەدات لە لایەك چاكسازی كردوو، لە لایەكیش ستەم و ناحەقی .

ئەو ستەم و ناحەقیەی، كە بە هۆی ئەو كاردانەوەیە دروست بوو – جا چ لە خۆوە بێت، یاخود ئەو جولەكانە درووستیان كردبێت، كە لە بەر ژەوەندی خۆیان كارەكانیان هەڵدەسوڕاند[١]، فراوان كردنی بازنەی چەمكیئازادی كەسیی (الحریة الشخصیة)بوو تا ئاستێك، كە مافی بێ دینی و بێ ئابڕویش بگرێتەوە، لە بەرانبەر ئەو زەبوونیەی، كە ژیانی ئەوڕوپای ئەوسای سەردەمە تاریكەكانی پێناسرا بوو و، بووە یەكێك لە سیما سەرەكیەكانی دیموكراسی و، لەو كۆڵەگانەیە، كە ناكرێ بە خراپە دەستی لێ بدرێت، هەتا ئەگەر باس لە خودی (خوا)ش بكات، یاخود یەكێك لە پێغەمبەران(علیهم الصلاة و السلام)یاخود یەكێك لە ڕەووشتە بەرزەكان، كە مرۆڤی پێ لە ئاژەڵ جیا دەكرێتەوە.

---

[١] ) دەتوانی بۆ خوێندنەوەی (ڕۆڵی جولەكە لە تێكدانی ئەوڕوپا)، بگەڕێیەوە سەر كتێبی(مذاهب فكریة معاصرة).

ئیتر ئەمە بەسە بۆ سەلماندنی فەسادی و گومڕاییەك، كە دیموكراسی پشتگیری دەكات و بە ددانی ژێری گازی لێ دەگرێت و، بە یەكێك لە شانازیەكانی دەزانێت!

★★★★

كۆڵەگەی هەرە گەورەی دادگەری سیاسی لە ئیسلامدا، بریتیە لەوەی نەهێڵێ مرۆڤ یاسا دابنێ و، دانانی یاسا بە مافێكی تایبەتی خوا (سبحانه وتعالى)دابنێ و، كە هەر ئەو شایستەیە یاسا دابنێت و، هەر ئەو پێوانەكان دیاری دەكات، هەر ئەو دەتوانێت حەق و ناهەق بۆ مرۆڤ دیاری بكات، بە حوكمی ئەوەی، كە هەر ئەو وەدیهێنەر (الخالق) و، ڕۆزیدەر (الرزاق)و، خاوەن هێزو، هەر ئەو كاربەجێ (الحكيم)و، زانا (العليم)ەو، هەرئەو دوڵەمەند(الغنى) ەو، هەر ئەو بەبەزەیی و نەرم و نیان (اللطيف)و، شارەزا (الخبير)و.. تا كۆتایی هەموو ئەو سیفاتانەی، كە تەنیا لە خوا دەوەشێنەوە و شایەنی ئەون﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأعراف: ٥٤. واتە:هەرچی درووست كردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، ئیتر بە حوكمی ئەوەی كە هەر ئەو وەدیهێنەرە، مافی داڕشتنی ژیانی ئەوانەشی هەیە كە درووستی كردوون و، ڕۆزی داون و بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٩. واتە: هەر ئەو زاتە هەموو

شتێکی لە زەویدا بۆ ئێوە درووست کردووە، پاشان ویستی ئاسمان درووست بکات، بۆیە بە حەوت چین بەدیهێناو ڕێکی خستن، هەر خۆیشی بە هەموو شتێك زانا و ئاگادارە. وە بە حوکمی ئەوەی کە ئەو بەهەموو شتێك زانایە، هەر ئەویش دەزانێت، کە بەرژەوەندی درووست کراوەکانی لەکوێدایە، کە خۆی بەتەنها درووستی کردوون و، بەتەنها ڕۆزی داون و، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە ﴿ سُبْحَـٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ﴾ یونس: ٦٨ بەحوکمی ئەوەی، کە ئەو بێباك (الغني)ەو، هیچ بەرژەوەندییەکی لەلای هیچ لە درووستکراوەکانی نیە، تا لەپێناویدا خۆشی بوێن. بەڵکو هەموویانی بە یەکسانی درووست کردوون و، هەمووشیان وەکو یەك بەندەی ئەون و، هەمووشیان بە یەکسانی بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە، بۆیە خوا (جل جلاله)یاسا لە بەرژەوەندی کۆمەڵێك دانانێت لەسەر حیسابی کۆمەڵێکی دی. یاسا بۆ دەوڵەمەندان دانانێت لەسەر حیسابی هەژاران، نە بۆ هەژارانیش لەسەر حیسابی دەوڵەمەندان، نە بۆ سپی پێست لەسەر حیسابی ڕەش پێست و، نە بۆ ڕەش پێست لەسەر حیسابی سپی پێست، بەڵکو یاسا بۆ هەموو مرۆڤێك دادەنێت، بۆ دەوڵەمەند و هەژار و، سپی و ڕەش، یاسایەکی دیاری کراو کە هەموو پێیەوە پەیوەست بن و پەیڕەوی لێ بکەن و، بەرژەوەندی هەمووان وەدی بێنێ، لە بەرانبەردا یاسا مرۆڤ کردەکان زۆربەی کات زوڵم و ستەمی بۆ کۆمەڵێك تێدایە لەسەر حیسابی کۆمەڵێکی دی، بەهۆی ئەو دەمارگیری و لایەنگیریەی کە لە مرۆڤدا هەیە، هەروەها سەرخستنی بەرژەوەندی خۆیان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی کەسانی تردا.. تەنیا ئەوانەی، کە خودا ڕەحمی پێکردوون و لەو جۆرە

ئاکارانە دەری هێناون﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴾ المعارج: ١٩ — ٢٢

واتە: بەڕاستی ئینسان بە شپرزەیی و تەنگەتاوی درووست کراوە. کاتێك ناخۆشی تووش بێت بێزار و دەم بە هاوارە . کاتێکیش خێرو بەرەکەتی تووش بوو، دەستی دەنووقێت و قەدەغەی چاکە دەکات. تەنها ئەو نوێژ کەرانە نەبن.. ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴾ العادیات: ٨. واتە:بێگومان ئادەمیزاد لە خۆشەویستی ساماندا زۆر بەتین و هەڵپەیە(کە دەستی لێی گیر بوو ڕەزیل و ڕژد و چرووکە).

****

کۆڵەگەی دووەم لە دادگەری سیاسی لە ئیسلامدا، بریتیە لە ناچارکردنی فەرمانڕەوا(الحاکم)و، ژێر فەرمان(المحکوم)، بە حوکم کردن بەو یاسایەی، کە خوا ناردوویەتیە خوارێ.

حاکم و فەرمانڕەوا بە دادگەری پابەند کراوە﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾ النساء: ٥٨. واتە:بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات، کە هەموو ئەمانەتەکان(سپاردەکان)بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و، هەرکاتێکیش داوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا، دادگەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بە جوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێدەدات، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام، بیسەرو بینایە.

ئەوانــەش بــە فــەرمانن پابەنــدن بــەوەی، کــە بــەگوێی ســەرۆك و دەسەلأتداران بکەن، ئەوانەی کە ئیتاعەو بەفەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکـەن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾ النساء: ٥٩. لە ئایەتەکەدا بەڕوونی دیارە، کە گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بەهـەموو جۆرێـك واجبـە. بـەلأم گوێڕایـەڵی فەرمانڕەوا، بۆ گوێڕایەڵی ئەو بـۆ خـواو پێغەمبـەر (ﷺ)ەوە گـرێ دراوە. ئەگەر خوا فەرمووبای:گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبـەر و فـەرمانڕەواکان بـن، ئـەوا گوێڕایـەڵی فـەرمانڕەواش وەکـو گوێڕایـەڵی خـوا و پێغەمبـەر(ﷺ) واجب دەبوو. بـەلأم خـوا (جـل جلالـه)وای نەفـەرمووە، بـەڵکو گوێڕایـەڵی فـەرمانڕەوای بـە گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبـەر(ﷺ) بەنـد کـردووە، کـە بەتەنها ئەو جۆرە گوێڕایەڵییە بە هەموو شێوەیەك واجبـە، بـە بەڵگـەی حەواڵـە کردنـی ئـەو کارانـەی، کـە ناکۆکیـان تێدەکـەوێت بـۆ سەرچـاوەی ســەرەکی فــەرمان وەرگــرتن و گوێڕایــەڵیکردن، کــە ئــەویش خــوا و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ).

ئەبو بەکریش(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)هـەر بـەو جـۆرە تێگەیشـتبوو، کاتێـك گـوتی:گوێڕایـەڵیم بکـەن، تـا ئـەو کاتـەی گوێڕایـەڵی خـوا و پێغەمبـەر(ﷺ) م کـرد، ئەگـەر بـێ ئـەمری خـواو پێغەمبـەر(ﷺ)م کـرد. ئـیتر گوێڕایـەڵیم لەسـەر ئێـوە پێویسـت نیـەـبەمـەش ئـەو دەسـتوورە بـۆ ئوممــەتی موســوڵمان دانــرا، کــە لــە کتێبــی خــوا و ســوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) سەرچاوەی گرتووە.

هەرچەندە لێرەدا بواری خستنەڕووی حوکمی سەرۆك و فەرمانڕەوای ستەمکارمان نیە، کە بابەتێکە لە کتێبە فیقهییەکاندا دەخرێتەڕوو، بەڵام بە کورتی و بەخێرایی دەڵێین:پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی هەڵکوتانە سەر فەرمانڕەوای بە چەك کردووە کە لە بنەڕەتدائەو حاکمە حوکم بەوە دەکات، کە خوا ناردوویەتیە خوارێ، بەڵام لە جێبەجێکردندا ستەم دەکات، چونکە بە دڵنیاییەوە ئەم چوونە دەرەوەیە لە دژی، جۆرە فەسادییەك دەنێتەوە، لادانی خراپەش لە هێنانی چاکە لەپێشترە. بەڵام ئەگەر وا گومان ببرێت، کە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمری بە ئوممەت کردووە لە بەرانبەر زوڵم و ستەمدا بێدەنگ بێت، ئەوە کارێکە، کە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دانیان پێدا نەناوە. هەرکەسێك بیەوێت با بگەڕێتەوە سەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و، بەدوای تاکە بەڵگەیەکدا بگەڕێت کە تیایدا دان بەو کارە دانرابێت، بەچاوپۆشین لەوەی، کە بەسەر ئوممەت دا هاتووە بە درێژایی مێژوو، چونکە ئیسلام بەڵگەو بیانووە بەسەر ئوممەتدا نەوەك ئوممەت بیانووبێت بەسەر ئیسلام!

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵوێستی توند بووە بەرانبەر بە چوونە دەر لە دژی فەرمانڕەوای زاڵم و ستەمکار، بەڵام لە بەرانبەردا چەن دەرگایەکی والآ کردوون بۆ نەهێشتنی زوڵم و ستەم، بۆ ئەوەی لەسەر زەویدا جێگیر نەبێت، لەوانە ئامۆژگاری، ئەمر کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە و، ئەو شتانەی کە لە زمانی سەردەمدا بە (هۆکارە سیاسییەکان )ناسراون، بەڵام هەرگیز ئەمری بە بێدەنگی لە بەرانبەر زوڵم و ستەمدا نەکردووە، هەرگیز بانگەوازی ڕازی بوونی لە بەرانبەر زوڵم و ستەمدا نەکردووە و،

لەچەند فەرموودەیەکدا فەرموویەتی:اذا رأیتم أمتي تهاب أن تقول للظالم یا ظالم فقد تودع منها)رواه الامام أحمد في مسنده. واتە:کاتێك ئوممەتی من وای لێهات نەوێرێ بەستەمکار بڵێ ستەمکار، ئەواخواحافیزی لێبکە.

(سید الشهداء حمزة، و رجل قام الی امام فأمره و نهاه فقتله)رواه الحاكم في المستدرك. واتە:گەورەی شەهیدان حەمزەیە، لەگەڵ پیاوێك کە لەبەردەم فەرمانڕەوایەکی ستەمکار هەستێتەوەو ئەمری پێبکات بەچاکەو قەدەغەی خراپەی لێبکات، پاشان بکوژرێت.

(الدین النصیحة، قلنا لمن؟ قال: لله، ولکتابه، و لرسوله، ولأئمة المسلمین، وعامتهم) رواه مسلم. واتە:دین ئامۆژگارییە، گوتمان بۆ کێ؟ فەرمووی: بۆ خوا و بۆ کتێبەکەی و بۆ پێغەمبەرەکەی و سەرانی مسوڵمان و گشت موسوڵمانان.

(من رأی منکم منکرا فلیغیره بیده، فمن لم یستطع فبلسانه، فمن لم یستطع فبقلبه، وذلك أضعف الایمان) رواه مسلم. هەرکەسێك لە ئێوە خراپەیەکی دی، با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی، با بە زمانی بیگۆڕێت، ئەگەر هەر نەیتوانی با بەدڵی پێی ناخۆش بێت، ئەمەش بێهێزترین ئاستی ئیمانە.

(انه یستعمل علیکم أمراء، فتعرفون و تنکرون، فمن کره فقد برئ ومن أنکر فقد سلم، ولکن من رضي وتابع)رواه مسلم. لەمەودوا کەسانێك دەبن بە کاربەدەستتان، خراپەکانیان دەزانن و ڕێگریان لێ دەکەن، هەرکەسێك بەدڵ پێی ناخۆش بێ و توانای لابردنی خراپەکانیانی نەبێ، ئەوا لە گوناهی ئەوان بەشدار نیە، هەر کەسێك بەدەست و زمان ڕێگریان لێبکات،

لـەگوناه و ســزایان بەشــدار نیــە، بــەڵکو کەســێك بەشــداری گونــاه و سزاکەیانە، کە شوێنیان دەکەوێت و پێیان ڕازییە.

****

ئەم دەستووره، کە لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەرچاوەی گرتووە، گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا بەسەر ئوممەت دا پێویست دەکات-تا ئەو کاتەی، کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) دەکات-بەلاّم لە هەمان کاتدا، ئوممەت ئەرکی چاودێریکردنی کارەکانی فەرمانڕەوای پێ سپێردراوە، تا فەرمانڕەوا پەیوەست بێت بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارێ. چونکە فەرمانڕەواو ژێر فەرمان-لە ئیسلامدا بەو جۆرەی کە خوا ناردوویەتیە خوارێ-هاوبەشن لە دەستەبەر کردنی پەیوەست بوون بەوەی، کە خوا ناردویەتیە خوارێ و، ئەمریش –لە هەردوو لایەوە-پێویستە بۆ وەدیهێنانی ئەو پەیوەستییە. چونکە لەسەر فەرمانڕەوا پێویستە دەسەلاّتێکی وای هەبێت، کە خەڵکی ناچار بکات تا لەگەڵ خواستەکانی شەرعی خوادا بگونجێن و، ئەوانەی، کە لەو خواستانە دەردەچن سزا بدرێن، لەسەر ئوممەتیش پێویستە-لەلایەکی دی-دەسەلاّتێکی هەبێت، کە فەرمانڕەوا ناچار بکات لە چوارچێوەی شەرعی خوادا حوکم بکات، بەمەش هەردوو دەسەلاّتەکە دەبنە تەواوکەری یەکتر بۆ وەدیهێنانی خواستەکانی ئەم دینە.

ئەم دەستووره لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا(ڕەزای خوای لەسەربێت)بە تەواوی جێبەجێ دەکرا، کاتێك چووە سەر دوانگە(المنبر) و گووتی:ئەی خەڵکینە گوێ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن، سەلمانی فارسیش(ڕەزای خوای لەسەر بێت)گووتی:ئەمڕۆ نە گوێ بیستت دەبین،

نـە گوێڕایەڵیشـت دەکـەین، عومـەریش (ڕەزای خـوای لەسـەربێت)گـوتی :بۆچی؟سەلمان(ڕەزای خوای لەسەربێت) گـووتی:تـا پێمـان نـەڵێی، کـە ئـەو قوماشەی کردووتە بە عەبا، لە کوێت هێناوە، لـە کاتێـدا، کـە تـۆ پیـاوێکی چوار شانەو بەرزی و پارچە قوماشێکت بەش ناکات. پاشان عومـەر(ڕەزای خوای لەسەربێت) بانگی عەبدوڵڵای کوڕی کرد(ڕەزای خوای لەسـەربێت)و، پێی گووت:بـە خـوا سوێندت دەدەم، ئایـا ئـەو قوماشـەی کـە کردوومەتـە عەبا هی تۆیە؟عەبدوڵڵاش ڕووی لە خـەڵك کـردو گـووتی:بـاوکم پیـاوێکی چوارشـانەو بـاڵا بـەرزەو، بەتـەنها وەکـو هـەموو موسـوڵمانان پارچـە قوماشێکی بەش ناکـات، بۆیـە مـن پارچـە قوماشـەکەی خـۆمم داوەتـێ، تـا بیکاتە عەبا بۆخۆی. پاشان سەلمان(ڕەزای خوای لەسـەربێت)گووتی:ئێستا ئەمر کەاگوێ دەگرین و گوێڕایەڵیشت دەکەین.

هـەروەها جارێکیـان عومـەر(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)هەسـتایە سـەر مینبەر و باسی نەهی کردنی کرد لە زۆری پارەی مـارەیی، پاشـان یـەکێك لە ئافرەتە موسوڵمانەکان، نوێنەرێکی ناردە لای عومەر و پێی گووت:ئـەی پێشەوای باوەڕداران شتێکی فراوانت تەسـك کردۆتـەوە، لەکاتێـدا کـە خـوا دەفەرموێت﴿ وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا فَلَا تَأۡخُذُواْ مِنۡهُ شَيۡـًٔا ﴾ النساء:٢٠، عومەریش (ڕەزای خوای لەسەربێت) گووتی:عومەر هەڵەی کردووەو، ئـەو ئافرەتــە ڕاســت دەکــات. بەمــەش نموونەیــەکی جــوانی پیشــاندا لــە پابەنـدبوونی بـەو دەسـتورەی، کـە لـە قورئـان و سـوننەتی پێغەمبـەرەوە سەرچاوەی گرتوە.

لێرەدا ئەوەی کە پێشتریش گووتمان دووبارەی دەکەینەوە، کە ئەگەر ئوممەت بە درێژایی مێژوو بەم دەستووورە پابەند نەبێت، ئەوا ئیسلام بەڵگەیە لەسەر ئوممەت، نەك ئوممەت بەڵگەبێت لەسەر ئیسلام.

کۆڵەگەی سێیەم لە دادگەری سیاسی لە ئیسلامدا بریتییە لە ڕاوێژ(الشوری).

ڕاوێژ لە ناخی ئەم دینەدا زۆر ڕۆچوّتە خوارێ[٢]، ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشوری: ٣٨. واتە:ئەوانەش بە دەم بانگەوازی پەروەردگاريانەوە چوون و نوێژەكانيان بە چاكی ئەنجامداوەو، كارو باريان هەردەم بە مەشورەت و ڕاوێژكارييەو لەو ڕزق و ڕۆزييەی، كە پێمان داون، دەبەخشن.

هاتنی باسی ڕاوێژ لە نێوان ئەودوو فەرزە كە دەبێ بكرێن (نوێژو ڕۆژوو)، پێمان دەڵێت، كە ڕاوێژيش وەكو ئەوان فەرزەو، پێويستە لە كۆمەڵگای موسوڵماندا بەرپا بكرێت.

ئەوەی كە بە ڕوونی ئەم مانايە نيشان دەدات، ئەو ئايەتەی سوورەتی (ال عمران)ە، كە خوای پەروەردگار فەرموويەتی:﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل

---

[٢]) ئەگەر دەتەوێ دەربارەی ڕاوێژ زياتر بخوێنيەوە، دەتوانی سەرنجی كتێبی(مكانة التربية في العمل الاسلامی) بدەی.

عمـران: ١٥٩. واتـە:کـەوابو(ئـەی موحەممـەد(ﷺ))، بـەهۆی ڕەحمـەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بوویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تووڕەو قسەڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوا هەموو لەدەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێ بکەو لێیان ببورەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێبکە، (دوای مەشورەت و پرس و ڕا)ئەگەر بڕیارت دا (کارێك ئەنجام بدەی، ئەنجامی بدەو)پشت بە خوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت، کە پشتی پێ دەبەستن.

چیرۆکەکەش دیار و ئاشنایە، کە لە کاتی جەنگی ئوحوددا، ڕیش سپیەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد، کە لەشکری موسوڵمانان لە ناو مەدینەدا بمێنێتەوە. هەر کاتێ دوژمن هات دەوری مەدینەی دا، ئەوا تێکیان بشکێنن، گەنجانیش مەیلی ئەوەیان هەبوو، کە بڕۆنە دەرەوەی مەدینەو لەوێ شەڕ لەگەڵ دوژمن دا بکەن، بۆ دەرخستنی خواستی جیهاد لە پێناو خوادا و، بەدەستهێنانی یەکێك لە چاکەکان:سەرکەوتن، یان شەهید بوون، هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ التوبة: ٥٢. واتە: بە دووڕووەکان و بێ باوەڕان بڵێ:ئایا ئێوە لە یەکێك لەو دوو سەرئەنجامە چاکە زیاتر چاوەڕوانی چیمان بۆ دەکەن، لە کاتێکدا هەردووکیان چاکن و ئاواتیان بۆ دەخوازین کە:( سەرکەوتنە، یان شەهیدبوون). وە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەو خواستەی گەنجانی دیت، چووە پاڵ ئەوان و لەشکریان بردە دەرەوەی مەدینە، لە سەرەتای شەڕەکەدا، موسوڵمانان باڵا

دەست و سەرکەوتوو بوون، بەلاّم کاتێك، کە تیر هاوێژەکان بێ ئەمری پێغەمبەری خوا(ﷺ)یان کرد، کە پێی فەرمووبوون، لە شوێنی خۆیان کە سەر چیا بوو، نەجوولێن، هەتا ئەگەر موسوڵمانان بالّندە لاشەیان دەرفێنن و کەوتوونەتە سەر لاشەیان، بەلاّم ئەوان(تیر هاوێژەکان)وایان گومان برد، کە شەڕەکە بەسەرکەوتنی موسوڵمانان تەواو بوو و، ئیتر کارەکە تەواو بووە، بۆیە لە شوێنەکەیان هاتنە خوارێ، بۆ ئەوەی بەشی خۆیان لە چەك و تفاق و کەلوپەلی بەجێماو هەڵبگرن، بەمەش موسوڵمانان، تووشی ئەم تێکشکانە بوون، کە حەفتا کەسیان لێ شەهید کرا و، ددانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، شکان و، زۆریان لێ بریندار بوون:تا خوا ئارامی (السكينة)ی بۆ ناردنە خوارێ، دواى ئەو خەمەی، کە تووشی ببووبوون: ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ﴾ آل عمران: ١٥٤، واتە:پاشان، دوای ئەو غەم و پەژارەیە، ئارامی و هێمنی بەسەردا دابەزاندن، کە وەنەوزێك بوو دەستەیەکتانی داگرتبوو، دەستەیەکی تریش بەڕاستی خەمی خۆیان بوو، گومانی ناڕەوایان دەبرد بە خوای گەورە بە گومانی نەفامانە.

ئیتر لەو کاتەوە بنچینەی ڕاوێژ بووە سەنگی مەحەك لە بیری هەندێ کەس، کە وایان دەبینی کە هەڵبژاردنی ڕای گەنجان لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)، هۆکارێك بوو بۆ ئەو دۆڕانەی، کە دووچاری موسوڵمانان بوو. وە کاتێك کە قورئان دادەبەزی و ئەمری بە پێغەمبەر(ﷺ)دەکرد، کە ڕاوێژیان لەگەڵ بکات، وا دەردەکەوێت ڕاوێژ

کۆڵەگەیەکی بنچینەییە لە کۆمەڵگەی موسوڵماناندا، کە ناتوانرێ لە خۆشی و ناخۆشیدا وازی لێبهێنرێ.

ئەوەی کە ئەم باسە پشت ڕاست دەکاتەوە، ئەو زانیاریانەیە، کە لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هاتووە، کە زۆر ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا کردووە(ڕەزای خوایان لەسەر بێت)، لەکاتێکدا، کە وەحی بۆ دادەبەزی و بەرچاوڕوونی بۆ دەکراو پێویستی بە ڕاوێژ نەبوو، هەر شتێك، کە بۆ بانگەوازەك، ە چاك بوایە، خوا بۆی دەخستە بەردەست و هەر ڕەفتارێك، کە پێویستی بە ڕاست کردنەوە هەبوایە خوا بۆی ڕاست دەکردەوە.

هەروەکو لە سێ شوێن لە قورئاندا هاتووە:﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴾ عبس: ١ - ٢. واتە : ڕووی گرژ کردو، ڕووی وەرگێڕا(مەبەست لە پێغەمبەرە(ﷺ)، کاتێك(عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتوم)، کە ئیمانداریکی نابینا بوو هاتە خزمەتی. ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾ التوبة: ٤٣. واتە: خوا لێت خۆش بێت(ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! بۆ مۆڵەتت دانێ؟(نەدەبوایە مۆڵەتیان بدەیتێ)هەتا بەچاکی بۆت دەربکەوێت، کێ ڕاستەو باوەڕ دامەزراوە، کێش درۆزن و دوو ڕووە﴿ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ الأنفال: ٦٧. واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوربوە لەسەر زۆر ڕاوێژکردن بە یارانی، لەکاتێکدا، کە خۆی پێویستی پێ نەبوو، ئەمەش بۆ دامەزراندن و جێگیر کردنی ئەو کۆڵەگەیەی دادگەری سیاسی بوو لە ئیسلامدا، تا ئەوەندە قووڵی بکاتەوە، کە لە دەروونی موسوڵماناندا، ببێتە بنچینەیەك لە بنچینەکانی کۆمەڵگەی موسوڵمان . ئەگەر ئوممەت لەبارودۆخە مێژووییەکان زۆر ئاوڕی لەم بابەتە نەداوەتەوە، ئەوا هەڵەی ئوممەت خۆیەتی و لەسەر ئیسلام حسێب ناکرێ.

ماوەتەوە بڵێین، کە ئەگەر ڕاوێژ لە شتە نەگۆڕەکان بێت، کە خوا ویستوویەتی لە ئوممەتی موسوڵماندا جێگیر بێ، ئەوا وێنەی ئەم نەگۆڕیە دەوەستێتە سەر واقیعی ئوممەت لەکات و ساتە جیاوازەکاندا. بۆیە ئەگەر هۆزێك لە بنچینەکانی کۆمەڵگە بێت لە کاتێکی دیاریکراودا و، تاکەکانی هۆزەکە پەیوەست بن بەو کارەی، کە سەرۆك هۆزبە چاکی دەزانێت، ئەوا نوێنەرایەتی کردنی سەرۆك هۆز لە هۆزەکەی کارێکی ئاساییە لەو بارودۆخەداو، پێویست ناکات ڕای تاکە تاکەی هۆزەکەی وەربگرێت، چونکە ڕای سەرۆك هۆز ڕای هۆزەکەیەتی، سەرەڕای ئەوەی، کە یەکێك لە سەرۆك هۆزەکان زۆر لە دەسەڵاتی خۆی کەم کردووە، ئەویش سەرۆك هۆزی(غوزەییە)یە، کە شاعیر (دورەیدی کوڕی سەمەح)ە، دەڵێت:

وهل أنا إلا من غزية ان غوت غويت وان ترشد غزية أرشد!

واتە:

من هەر تاکێکم لە غوزەییە، ئەگەر گومڕابوو
گومڕابووم، وە ئەگەر ڕاستەڕێ بوو، ڕاستەڕێ دەبم!

بەلاّم کاتیّ کە هۆزەکە لاواز دەبێت و، تاك سەربەست دەبێت، خۆی بیر دەکاتەوەو، خۆیشی بڕیار دەدات، لێرەدا پێویستە شێوازی ڕاوێژەکە بگۆڕێت، تا لەگەڵ بارودۆخی نوێدا بگونجێت.

ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت ئەوەیە کە ئایا ڕاوێژ لەسەر خواست (ویست) وەستاوە، یان سەپێنراوە؟ئایا یەك ئەنجومەن(المجلس)هەبێت، یان دوان.. هتد؟ ئەمانە کۆمەڵگەی موسوڵمان خۆی بەپێی بارودۆخ بڕیاری لەسەر دەدات، بەجۆرێك کار لە جێگیری نەکات و نەبێتە هۆی نەمانی، یاخود نەبێتە شتێکی ڕۆتینی و لە واقیعدا بوونی نەمێنێت، چونکە ئەمە پێچەوانەی کۆڵەگەی بنەڕەتی دادگەری سیاسییە لە ئیسلامدا.

★★★★

کۆڵەگەی چوارەم، ئەوەیە کە ئەو شتانەی خوای پەروەردگار ڕێگای بە ئیمانداران داوە کە کۆشش(اجتهاد)ی تێدا بکەن، بەستراوەتەوە، بەو شتە نەگۆڕ(ثابت) انەی، کە پەروەردگار لە قورئاندا و، لە سوننەتی پێغەبەر(ﷺ)، دا جێگیر کراون، بەو پێیەی، کە هیچ حەرامێك حەلاڵ نەکات و هیچ حەلاڵێکیش حەرام نەکات و، لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا تێکنەگیرێت.

ئەم کارەش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە.

جا کاتێك، کە مرۆڤ کۆشش (اجتهاد) کردنی لە شتە گۆڕاوەکان (المتغيرات) دا لێ قەدەغە دەکرێت، ئەوا ژیان و گوزەران دەوەستێت و، ڕێگا بە کۆمەڵێك خەڵك دەدات لە کۆمەڵگە ستەم بکەن، هەروەها ئەگەر بەبێ سنوور دەرگا بۆ کۆشش(اجتهاد) کردن والاّ بکرێت، هەروەکو کە دیموکراسی دەیکات(لەوەی کە زەرەر بە بەرژەوەندی سەرمایەداری

ناگەیەنێت!)، ئیتر ئەوە ڕوو دەدات، کە خەڵکی لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا دەیبینن، لە بڵاوبوونەوەی هەموو جۆرێکی بێ ئابڕویی و، لێکترازانی بەندەکانی ڕەووشت بەرزی لەلای خەڵك و، بێهێزی باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و، سەرقاڵی خەڵك بە دونیاو، هەوڵدان بەناوی هونەر و داهێنان و سەربەستی تاك، بەمەش بەندەکانی خێزان لێکدەترازێن و هەریەك لە پیاو و ئافرەت و کچ و کوڕ بە ئارەزووی خۆیان ڕەفتار دەکەن، بەمەش مرۆڤ ئادەمییەتی خۆی لەدەستدەدات.

بەڵام لە ئیسلامدا ئەمە ڕوونادات.

خەڵك لە شتە گۆڕاوەکاندا کۆشش دەکەن، تا لەگەڵ باروودۆخیان بگونجێت، بەڵام هەرگیز حەرامێك حەڵاڵ ناکەن، هەرگیز مەی(خمر) حەڵاڵ ناکەن، هەرگیز سوو(الربا)حەڵاڵ ناکەن، هەروەها بێ ئابڕویی بە هەموو جۆرەکانیەوە –بۆ خەڵکی حەڵاڵ ناکەن[٢]، وەهیچ حەڵاڵێك حەرام ناکەن، خەڵکی ناکەنە بەندەی خۆیان، لەکاتێکدا کە بەسەربەستی لەدایك بوون(هەروەکو عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لەسەربێت) گوتوویەتی)، هەروەها ڕێگری لە کچان ناکەن، کە میرات وەرنەگرن، هەروەك کە کوڕ بۆی هەیە میرات وەربگرێ نایاندەن بەشوو، بۆ کەسێك کە پێی ڕازی نین.. بە دەیان و سەدان هەڵوێستی تر هەن، کە لێرەدا بواری خستنەڕوویانمان نییەو، باسەکەمان لەسەر ئادگارە گشتییەکانی کۆمەڵگەی موسوڵمانە، کاتێك کە ئیسلام بەشێوە ڕاستەکەی خۆی پەیڕەو دەکرێت.

---

[٢] ) دواتر باسی جیاوازی پشکی ئافرەت لەگەڵ پشکی پیاو دەکەین لە میراتداو، حیکمەتەکەی لە دینی خوادا دەخەینەڕوو.

هەروەها دەرگای کۆشش (اجتهاد)بۆ هەموو کەس والاّ نیە، بەلّکو کۆمەلّێك لە زانایانی ئایین ئیجتیهادەکە دەکەن و، بۆ هەر شتێك دەگەڕێنەوە سەر بەلگەو دەقی شەرعی و، هیچ هەوا و ئارەزووی تێکەلّ ناکرێت، هەرچەندە لەوانەیە ڕای یەکێك لە زاناکان لە یەکێکی تر جیاواز بێ(کە لەواقیعدا زۆر ڕوودەدات)، بەلاّم ئەو جیاوازی ڕایانە ناگاتە ئاستی حەلاّلّ کردنی حەڕامێك، کە خوا حەڕامی کردبێت، یان حەڕام کردنی حەلاّلێك، کە خوا حەلاّلی کردبێت، ئەمەش دەستەبەری مانەوەیە بۆ کۆمەلگەیەکی سەرڕاست و تێگەیشتو، کە حوکم بەو یاسایانە دەکات، کە خوا ناردوونیەتە خوارێ.

## دادگەری ئابوری لە ئیسلامدا

کۆڵەگـــەی یەکـــەمی دادگـــەری ئـــابوری لـــە ئیســـلامدا، بریتیـــە لەحەڕامکردنی سوو(الربا).

سوو(الربا)، لە هەموو پەیامە ئاسمانیەکاندا نەفرەتی لێکراوە، بەڵام جولەکەکان(زلە سوو خۆرەکان)، یاریان بەو دەقە خواییانە کرد، کە لە تەوراتدا هاتبوون لە دژی سوو، لەسەر عادەتی خۆیان لە گۆڕینی هەر دەقێك، کە ڕێگری لە هەواو ئارەزووەکانیان بکات، بۆیە هەڵی دەگێڕنەوە، تا لەگەڵ ئەو بارودۆخە فەساد و خراپەی، کە تیایدان بیگونجێنن، لە تەوراتدا هاتووە:(شت بە سوو (الربا)بە براکەت مەفرۆشە). ئەوانیش ئەم دەقەیان وەرگێڕاو گووتیان، واتە:بە برا جولەکەکەت، بەڵام خەڵکی تری غەیرە جوولەکە، ئەوا بەتاڵان بردنی ماڵ و سامانیان لە ڕێگەی (سوو)ەوە ڕەوایە، قورئانی پیرۆزیش لەبارەیانەوە دەفەرموویت: ﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴾ آل عمـران: ٧٥. واتـە :ئەوانـە بۆیـە وا دەکـەن، چـونکە دەڵـێن:لـە بەرانبـەر دەسـتەی نەخوێندەوارانـدا (مەبەسـتییان موسوڵمانانە)لێپرسراو نابین(ئەگەر فێڵیان لێبکەین و ماڵیان بخۆین)، ئەوانە بەدەم خواوە درۆ هەڵدەبەستن و دەشزانن، کە درۆ دەکەن..

بەلاَم دەقەكانی قورئانی پیرۆز لەبارەی قەدەغە كردنی ڕیباوە، زۆر ئاشكراو یەكلاییكەرەوەن، بەجۆرێك، كە بوار بە هیچ كەس نادەن، بە جۆرێكی تر ماناكەیان لێكبدەنەوە:﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٧٥ - ٢٧٩. واتە:ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوكەوت ناكەن و، ڕاست نابنەوە(لەگۆڕ)دا، مەگەر وەك ئەو كەسەی كە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت(هەر لە دونیادا سرووشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن)، چونكە ئەوانە دەڵێن:كڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە(لە حاڵێكدا): خوا كڕین و فرۆشتنی حەلاڵ كردووەو، سووی حەرام كردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستی كەوتووە، بۆخۆی، كاری (لێپرسینەوەشی)، دەكەوێتە لای خوا، بەلاَم ئەوەی دەست بە سوو خۆری بكاتەوە، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی

هەمیشەیی تیادا دەبەنە سەرخوا، (سوو)تەفرو تونا دەکات و بەرەکەتی لێ هەڵدەگرێت، بەڵام پاداشتی خێر و سامان بەخشین برەو پێدەدات و بەرەکەتی تێدەخات، بێگومان خوا هیچ کافرێکی تاوانباری خۆشناوێت. بەڕاستی ئەوانەی، کە باوەڕیان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوەو، نوێژەکانیان بەچاکی بەجێهێناوەو، زەکاتیان داوە، تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، ئەوسا نە ترس و بیمیان لەسەرە، نە غەم و پەژارە دەیانگرێتەوە. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکار و خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن، ئەگەر ئیماندارن. خۆ ئەگەر وا نەکەن، ئەوا جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕابگەیەنن(کە سەرئەنجامەکەی زۆر سامناکە)، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و(لە سوو خۆری وازبهێنن)ئەوا تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نە ستەم دەکەن(لە قەرزدارەکان)، نە ستەمتان لێدەکرێت.

ئەم جۆرە توندیە، بۆ هیچ تاوانێکی تر، جگە لە سوو(الربا)، لە قورئاندا نەهاتووە، بۆیە واتاکەی ئاشکرایەو، گومانێك جێناهێڵێت.

تاوانی گەورەی سوو(الربا) ئەوەیە، کە پێویستی مرۆڤ بۆ ماڵ و سامان بەهەل دەزانێ و ئیستیغلالی دەکات، بۆ ئەوەی قازانجێکی زۆر بکەوێتە دەست خاوەن سامان، بەبێ ئەوەی هیچ هەوڵ و ماندووبوونێکی لە پێناودا کردبێت، هەروەها ئەم تاوانە دژ بە مرۆڤایەتیە، لەلای هەر کەسێکی خاوەن بیروهۆش ئاشکرایە، هەرچەندە ئەنجامدەرانی ڕیبا بروبیانووشی بۆبێننەوە، تا تاوانەکەیانی پێ داپۆشن.

ئەم تاوانە تا سەدەکانی کۆتایی(سەردەمی سەرکێشی جوولەکەکان)، زۆر ئاشکرا نەبوو. چونکە لەسەردەمی پێشووتردا تاکەکان خۆیان

سامانیان لە خاوەنەکەی وەردەگرت، تا هەندێك کاری تایبەتی خۆیانیانی پێ ڕاپەڕێنن، بەمەش دەکەوتە تۆڕی ڕیبا و، لە کۆتاییدا ئەگەر قەرزدار توانای دانەوەی قەرزەکەی نەبوایە، پارەکە چەند ئەوەندەی خۆی زیادی دەکرد، بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، تاوانەکە زۆر گەورەتر و، فراوانترە. چونکە کێشەکە کێشەی تاکێك بەرانبەر تاکێکی تر نیە، بەڵکو بۆتە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی و فراوانتر بووە و، خەڵکی بە ملیۆنان و ملیاران، بە داوی ڕیباوە دەبن!

لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو، شارەزایەکی ئەڵمانی، کە ناوی (جۆزێف شاخت)بوو، ڕاپۆرتێکی نووسی لەسەر ڕیبا، تیایدا ئەوەی خستەڕوو، کە ئەنجامی سوو(الربا)بریتیە لە کەڵەکەبوونی سامان، لەدەستی کەسانێك، کە بەبەردەوام ژمارەیان کەمدەکات و، کەمبوونی سامان و زیادبوونی هەژاری لە کەسانێکدا، کە بە بەردەوام ژمارەیان لە زیاد بوون دایە.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، ئەوانەی کە بە داوی ڕیباوە دەبن، تاکە تاکە نین، بەڵکو وولاّتان تووشی دەبن و، بە بەردەوامی دەکەونە ژێر باری قەرزەوە، بەمەش باری ئابووریان کز و لاواز دەبێت و، هەوڵ بەردەوام دەدەن، نا بۆ دانەوەی قەرزەکە، بەڵکو بۆ دانی ئەو سوو(الربا)ەی، کە دەچێتە سەر پارە قەرز کراوەکەوە، لەگەڵ مانەوەی قەرزەکە وەکو خۆی، لەلایەکی ترەوە هەندێ وولاّت، وولاّتانی تر دەکەنە کۆیلەو بەندەی خۆیان، لە بەرانبەر ئەو قەرزانەی، کە پێیان دەدەن، ئیتر ئەم لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا دەژی و، ئەویش سەیری ئازاری مرۆڤەکان دەکات، پاشان ئەو وولاّتانە -بەو پارەیەی، کە لە خوێنی هەژاران بە تالاّنیان بردووە-

دەست بەسەر کانگای ووزەی زەویدا دەگرن، بۆ ئەوەی زیاتر دەوڵەمەند بن و، زیاتر دەستیان بخەنە خوێنی هەژار و بێ تواناکان!.

ئەو حیکمەتە گەورەیەی خوای کارزان، کاتێك کە ڕیبای حەڕام کرد، بۆ ئەوە بوو، کە بەری ئەم تاوانە گەورانە بگرێ، جا چ لەسەر ئاستی تاکەکەس بن، یان لەسەر ئاستی وولاتان، بۆیە قەدەغەکردنی ڕیبای کردە کۆڵەگەی هەرە گەورەی دادگەری ئابووری لە ئیسلامدا.

*****

کۆڵەگەی دووەمی دادگەری ئابووری لە ئیسلامدا، کت و مت پێچەوانەی ڕیبایە، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەڕوونی ئاماژەی پێکراوە ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴾البقرة: ٢٧٦.
واتە:خوا، سوو، تەفرو تونا دەکات و بەرەکەتی لێهەڵدەگرێت، بەلآم پاداشتی خێرو سامان بەخشین برەو پێدەدات و بەرەکەتی تێدەخات.

ئەویش( زەکات)ە.

سەیری ئەو جیاوازیە مرۆڤایەتیە گەورەیە بکە، کە لە نێوان( سوو) و ماڵ بەخشیندایە !

لێرەدا مرۆڤێك، کە خاوەنی ماڵ و سامانە، بەدوای ئەوانەدا دەگەڕێت، کە پێویستیان بەو ماڵ و سامانە هەیە، تا بەهۆی قەرزەوە بیانخاتە داوی خۆی و، هەوڵ و کۆششیان بە فیڕۆ ببات و، خۆی بە ماڵی حەڕام قەڵەو بکات، لە بەرانبەردا لە ئیسلامدا مرۆڤێك، کە ماڵ و سامانی هەیە، لەپێناو خوادا هەندێك لە ماڵ و سامانەکەی جیا دەکاتەوەو، دەیخاتە دەستی هەژاران، تا لەو حاڵەی کە تێیدان، ڕزگاریان بکات، هەتا ئەگەر بۆ

نزمترین پلەی تەواوەتیش بێت، بۆ ئـەوەی بەسـەربەرزی بـژین و حاڵـیان باش بێت.

چەند جیاوازیەکی گەورە دەبینرێت لە نێوان ئەم و ئەودا، نـەك تـەنها لەڕووی ئابووریەوە، بەڵکو بەر لەوە لەڕووی مرۆڤایەتییەوە.

هـەموو ئاراسـتەکردنێکی ئیسلام لەسـەر بنچـینەی مرۆڤایەتیـە، بـەر لەوەی سیاسەت، یان ئابووری، یان کۆمەڵایـەتی، یـان فیکـری بێـت، لەسـەر ڕێـز گرتنـی مرۆڤایـەتی مرۆڤـە، بـەو پێیـەی، کـە مـرۆڤ لەلایـەن وەدیهێنەرەکەی، کە خوایە ڕێـزی لـێگیراوە: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء: ٧٠. واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نـەوەی ئـادەم گرتـووەو، بەسـەر ووشـکانی و دەریـادا(بـە جۆرەهـا هۆکـاری گواستنەوە)هەڵمان گرتوون و لە ڕزق و ڕۆزی پوخت و چاکی جۆراو جۆر بـەهرەوەرمان کـردوون(لـە خـۆراك و پۆشـاك و مـاڵ و ناومـاڵ و.. هتـد)بەڕاسـتی ئێمـە ڕێـزی زیـادەی ئـەوانمان داوە بەسـەر زۆربـەی ئـەو بەدیهێنراوانەدا، کە دروستمان کـردون(لـە هـەموو ڕوویێکـەوە، تـا قـەدر و ڕێزی خۆیان بزانن).

هەروەها لە پێناو ئەو ئـێش و ئازارانـەی، کـە خـەڵکی هـەژار و نـەدارو دەسـتکورت بـەهۆی ڕیبـاوە تووشـی دەبـن، خـوای کاربـەجێ فەرموویـەتی: ﴿یمحق الله الربا ویربی الصدقات﴾، هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَاْ فِيٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ

ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الروم: ٣٩. واتە:هەر پارەو سامانێکتان بە سوو دابێت بە خەڵکی بۆ ئەوەی زیاد بکات ئەوا، لەناو سامانەکەیاندا بەرەکەت ناکات و پاداشتی نابێت لای خوا(بەڵکو موحاسەبەشی لەدوایە)ئەوەیش، کە بە زەکات داوتانەو، مەبستتان ڕەزامەندی خوایە، ئا ئەو جۆرە کەسانە پاداشتیان چەند بەرانبەر کردۆتەوە. هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( لعن الله آكل الربا وموكله و كاتبه وشاهده)رواه مسلم. واتە: خوا لەعنەتی لە سوو خۆر کردوە، هەروەها لەعنەتی لە بریکارەکەی و نووسەر و شایەتەکانیشی کردووە .

تۆ سەیری نەفامی سەردەم (الجاهلية المعاصرة)و دیموکڕاسی سەرمایەداری بکە، کە هەموو کارەکانیان بە ڕیبا ئەنجام دەدەن و ئیددیعای ئەوەش دەکەن، کە تا ئێستا دادگەرترین نیزامە، کە مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژوو بەخۆیەوە دیبێ!!

****

کاتێك کە خوای پەروەردگار سوو(الربا)حەرام دەکات و زەکات بەسەر دەوڵەمەندانددا فەرز دەکات بۆ هەژار و نەداران، دەوڵەت هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی و لەوکارانەی، کە لە قورئاندا باسیان لێوە کراوە خەرجی دەکات، دەبێتە هۆی جوڵەیەکی ئابووری پاك.

جا بۆ ئەوەی سەرمایەکە ساڵ لەدوای ساڵ لەکەمی نەدات، لەسەر سەرمایەدار پێویستە کار بکات، تا بیبوژێنێتەوە. بەڵام ئیسلام بۆ بوژاندنەوەی مەرجی دانــاوە:کە(زۆرە ملێ)یی و دزی و قۆرخکردن(الاحتكار)ی پێویستیەکانی تێدا نەبێت و، ماڵی بەکرێ گیراو

نەخورێت و زێدەڕۆیی و بەپەنهانی نەبێت. ئیتر بەم شێوەیە هەڵی کار بۆ کرێکاران دەڕەخسێت و، کۆمەڵگە سەر لەبەری هاوبەشی دەکەن لە بەرهەمی ئەو بوژانەوە پاکەی، کەهیچ زوڵم و ستەمێکی بۆ هیچ کەس لێناکەوێتەوە.

ئاشکرایە، کە زەکات فەرزێکە دەوڵەت کۆی دەکاتەوە و، ئەوانەی کە نایدەن سزایان دەدات: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ التوبة: ٦٠ واتە: بێگومان زەکات تەنها بۆ هەژاران و نەداران و ئەو کەسانەی، کە کارمەندن بەسەریەوە و بەو موسوڵمانە نوێیانەی، کە تا ئێستا ئیمان لەدڵیاندا جێگیر نەبووە و، بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و بۆ(یارماتیدانی)قەرزدارەکان و بۆ گەیاندنی ئایینی خوا(هەربوارێك کە خزمەت بە بانگەوازی ئیسلام بکات و ئایینی خوا بەرەو پێش و سەرکەوتن ببات)هەروەها بۆ ئەو ڕێبوارانەش، کە پارەیان لێدەبڕێت و نەدار دەکەون، (دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە)فەرزە لەلایەن خواوە لەگەردنی ئیمانداران، خواش زاناو دانایە(لەسامان بەخشین و فەرزکردنی زەکاتدا).

هەروەها لەماڵ و ساماندا، جگە لە زەکات، جۆرێکی تریش لە بەخشین هەیە، کە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەیەوە فەرمویەتی، کەخوا فەرزی نەکردووە، بەڵام لەلای خۆشەویستەو ئەوانەی، کە ئەنجامی دەدەن ئەوا بەهەشت و ڕەزامەندی خوایان بە نسیب دەبێت: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ

مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٣ - ١٣٤ واتە: پەلە بکەن و پێشبڕکێ بکەن، تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك، کە پانایيەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران. ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لەهەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن و، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لەخەڵکی خۆشدەبن و لێبوردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکار و چاکەخوازانی خۆشدەوێت.

ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی پەروەردەی خوایی بۆ ئیمانداران:کەمترین ئاست فەرز دەکات، کە ژیانی بەبێ بوونی ناڵوێ و، سزا بۆ کەمتەر خەمانی دیاری دەکات و، بەبێ سنوور دەرگا بۆ بەخشین دەکاتەوە، کە چاکەکاران پێشبڕکێی بۆ دەکەن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزای خواو، بەمەش خێر و چاکە باڵ بەسەر هەمواندا دەگرێت.

****

کۆڵەکەی سێیەمی دادگەری ئابوری لەئیسلامدا بریتییە لە بەرپرسیارییەتی دەستەبەریکردن (التکافل)، بەهەردوو جۆری: فەڕز و خۆبەخشانە .

ئیسلام لەناو خێزاندابەرپرسیاریەتێکی دەستەبەریی فەڕز دەکات و دەیسەپێنێ، کە ئەویش سەرداری خێزانەو بەرپرسیاریەتی خەرجی هاوسەر و منداڵەکانی و خزمە هەژارەکانی لەسەرە.

هــەروەها بەرپرســیاریەتییەکی تــری کــراوەش هەیــە، کــە لــەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکانی کۆمەڵگەدا دەبێت، کە خـوا بـە هـەمو هۆیـەکانی خۆشەویستی، خۆشەویستی دەکات، پێغەمبـەریش(ﷺ) هـانی ئـەو جـۆرە بەرپرسیاریەتیەی داوە، تا بەرپرسیاریەتی دەستەبەریی ببێتە یـەکێك لـە خاسیەتە تایبەتەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی، دراوسێ مافی بەسەر دراوسێوە هەیــە، هــەژارەکانی گــەڕەك مافیــان بەســەر دەوڵەمەندەکانــەوە هەیــە، هەروەها هەژارەکانی ئوممەت بە گشتی مافیان بەسەر دەوڵەمەندەکانیەوە هەیە.

لە جوانترین و گەورەترین ئەو باسانەی، کە تا ئێستا لەمێژوودا تۆمـار کــراون، ئەوەیــە کــە کۆمەڵگــەی ئیســلامی لەســەردەمی عومــەری کــوڕی عەبدولعــەزیزدا -ئەگــەر بۆماوەیــەکی کــورتیش بێــت-گەیشــتە شــێوازە نمونەییەکەی و توانی لەزەویدا بچەسپێت، کە هەژاری تێدا نەما!

لـە کتێبـی(الامـوال)ی(ئـەبی عوبەیـد)دا هـاتووە کـە: (یـەحیای کـوڕی سەعید) دەڵێـت: عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز نـاردمی بـۆ کۆکردنـەوەی زەکاتی ئەفریقیا، دوای ئەوەی کۆمکردەوە، داوای ئەوەم کـرد، کـە هـەژاران بێن بۆ لام، تـا بیـان دەمـێ، بـەڵام کەسـم دەستنەکەوت، چونکە عومـەری کـەڕی عەبدولعـەزیز هـەموو خـەڵکی دەوڵەمەنـد کردبـوو، ئـیتر منـیش هەندێك کۆیلە (عبد)م پێ کڕین و ئازادم کردن.

هەروەها لە لاپەڕەی(٣٥٧-٣٥٨)ی هەمان کتێب دا هاتووە کـە: (عومـەری کــوڕی عەبدولعــەزیز)، نامەیــەکی بــۆ عەبدولحەمیــدی کــوڕی عەبدولڕەحمان- کە لە ئێراق بوو-ناردووە، کە ماڵ و سامان بداتە خەڵکی. (عبدولحەمید)یش نامەیەکی بۆ ناردووە کە:ماڵ و سامانم داوەتـە خـەڵك

و هێشتاش لە (بیت المال)دا هەر ماوە. پاشان نامەیەکی تری بۆ ناردەوە، کە هەر کەسێك دەیەوێت هاوسەرگیری بکات و پارەی نییە، ئەوا پارەی مارەییەکەی بۆ بدەو هاوسەرگیریەکەی بۆ ئەنجام بدە، ئەمیش بۆی نوسیوە کە:هەموو ئەوانەی، کە بەنیازی هاوسەرگیری بوون بۆم ئەنجام داون و هێشتاش ماڵ و سامان لە (بیت المال)ی موسوڵمانانندا هەر ماوە. پاشان نامەیەکی تری نووسیوە، کە بگەڕێن هەر کەس سەرانەی لەسەرە بۆی بدەن و یارمەتی بدەن، کە زەویەکەی دابچێنێت، چونکە ئێمە بۆ ساڵێك و دوو ساڵ نامانەوێت.

هەروەها لە لاپەڕە(٧٣٨)دا هاتووە کە:(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) نامەیەکی بۆ(لەیسی کوڕی سەعد)نووسیوە، کە قەرزی قەرزداران بداتەوە، ئەمیش بۆی نووسیوە، ئێمە دەبینین هەر پیاوێك خانوی هەیەو ئەسپ و خزمەتکار و کەل و پەلی پێویستی ناوماڵی هەیە. پاشان عومەر نامەیەکی تری بۆ نووسیەوە: پێویستە مرۆڤی موسوڵمان خانوییێکی هەبێت، کە تێیدا نیشتەجێ بیبێت، خزمەتکارێکی هەبێت، کە هەندێ کاری لەجیاتی ڕاپەڕێنێت و، ئەسپی هەبێت، کە جیهادی دوژمنەکەی بکات و، کەل و پەلی پێویستی ناو ماڵیشی هەبێت! بەڵێ! کەواتە قەرزی بۆ بدەنەوە، چونکە ئەو کەسە بە قەرزار حیسابە.

****

کۆڵەگەی چوارەمی دادگەری ئابوری لە ئیسلامدا بریتییە لە بەردەوام داماڵینی ماڵ و سامانەکان لە ڕێگەی فەرزی(میرات دا)و، دووبارە دابەشکردنەوەی بەشێوەیەکی نوێ، بۆ ئەوەی بە تەنها ماڵ و سامان لەدەستی چەند کەسێکدا کۆ نەبێتەوەو نەبێتە هۆی زوڵم و ستەم.

چونکە هەر کاتێك سامان لەدەستی لایەنێکدا کۆبووەوە، ئەوا جۆرەها گەندەڵی ئابوری و کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بەم باسە کردووە:﴿ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ ﴾ الحشر: ٧. واتە: بۆ ئەوەی ئەو مالّ وسامانە تەنها لەنێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت، کە پەروەردگار نایەوێت مالّ و سامان بە تەنها لەدەستی دەوڵەمەنداندا کەڵەکە ببێت، بەڵکو دەیەوێت بکەوێتە دەستی خەڵکەوە. دیارە فەرزی میرات دابەشکردن بەشێوەیەکی بەردەوام بەکاری خۆی هەڵدەستێت، چونکە سامانی مرۆڤ کاتێك لەژیاندایە هەرچەندێك بێت، هەر دەبێت رۆژێ لە رۆژان لەم دونیایە بڕواو بەجێی بێلێ و، سامانەکەی بەسەر خاوەن بەشەکاندا، کە بە پێی شەرعی خوا میرات دەگرن، دابەش بکرێت، بەمەش کەڵەکە بوون و قۆرخکردنی سامان بە تەنها بۆ لایەنێك نابێت، بەڵکو بەردەوام چەند کەسانێکی تری نوێ کار بەم سامانە دەکەن و ئەم دەست و ئەم دەستی پێ دەکەن.

****

ئەمە چاوپێداخشاندنێکی خێرا بوو، کە گەورەیی ڕێبازی خوایی سەبارەت بە هەموو لایەنەکانی مرۆڤایەتی دەردەخات، بەتایبەتی سەرمایەداری ڕیباخۆری، کە دیموکراسی رۆژئاوا خۆی بە خاوەنی دەزانێت و لای وایە دادگەرترین سیستەمە، کە بە درێژایی مێژوو مرۆڤ پێی گەیشتبێت.

دیـــارترین جیـــاوازی نێـــوان ڕێبـــازی خـــوایی و ڕێبـــازی دیموکراســـی سـەرمایەداری ڕیبـاخۆریی ئەوەیـە، کـە لـە ئیسـلامدا دەوڵەمەنـدان یاسـاو ڕێساو شەریعەت دانانێن، چونکە یاسا دانان بە تـەنها مـاقی خوایـەو، مـرۆڤ تەنها بۆی هەیە شوێن ئەو یاسایە بکەوێت، کە خوا ناردویەتی.

لەباسی پێشوو باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوو، دەرمانخست کە ئەوەی کاروباری دیموکراسی رۆژئاوا هەڵدەسوڕێنێت سەرمایەیەو، ژیـان هـەمووی بۆ ئەو مەیسـەر کـراوەو، لـە پشـت پـەردەی ئـەو شـانۆگەریە جوانـەی، کـە وادەردەخات پیاوی سەرشەقام(رجل الشارع)حـوکم دەکـات، ئەگـەر درکمـان بەوە کرد، کە شەرعی خوا دەستی مرۆڤ دەبەستێت لـە یاسـا دانـان و، ئـەو بابەتـــە گۆڕاوانـــەی، کـــە بـــواری کۆشـــش(اجتهـــاد)کردنیـــان هەیـــەو، بەسـتراونەتەوە بـەو شـتانەی، کـە خـوا جـێگیری کـردوون، ئـەو جیاوازیـە گەورەیەمان بۆ دەردەکەوێت، کە لـەنێوان دادگـەری ئـابوری لـە ئیسـلامدا، کـە ڕێگـری لـە سـەرمایەدار دەکـات دەسـەڵاتی یاسـادانانی هـەبێت لـە بەرژەوەندی خۆی لەسەر حیسابی بەرژەوەندی کەسانی تردا(هەر ئەمەیە کە بە ڕاستی لەسەر زەویدا ڕوو دەدات)، لەگەڵ ئەو زوڵـم و سـتەمەی، کـە دیموکراســی سـەرمایەداری ڕیبـاخۆری دەیکـات و نـاوی ئـابوری ئـازاد (الاقتصاد الحر)ی لێدەنێ!

هەروەها جیاوازییـەکی تـری سـەرەکی هەیـە لـە نێـوان ڕێبـازی ئـابوری ئیســلام و ڕێبازەکــانی تــری مــرۆڤ، جــا چ ئــەو نیزامانــەی، کــە مــاقی خاوەندارییەتی تاکە کەس ڕەت دەکەنەوە (وەکو لەسەردەمی شیوعییەتدا دەکرا) یان ئەو نیزامانەی، کە ماقی خاوەندارییەتی تاکەکەسی بەبێ کۆت و

بەند بە ڕەوا دەزانێت (هەر ئەمەشە، کە لە رۆژئاوادا، دیموکراسی سەرمایەداری پەیڕەوی دەکات).

مافی خاوەنداریەتی تاکەکەسی لە ئیسلامدا زۆر ڕوون و ئاشکرایەو، شەریعەتی خواش بە قەدەغە کردنی فێڵ و تەڵەکەبازی و زۆرەملێیی و دزی دەیپارێزێت، بەڵام لە بەرانبەردا ئیسلام چەند کۆت و مەرجێکی داناون، کە ڕێ لە خاوەندارییەتی تاکەکەسی دەگرێت، تاستەم لە کەسانی تر نەکەن و، قازانج و زیان بە دادگەری لە نێوان خەڵکیدا دابەش دەکات.

پێشتر باسی کۆت و مەرجی یەکەممان کرد، کە ڕێ گرتن بوو لە یاسا دانان لەلایەن سەرمایەدارەوە، لێرەشدا ئاماژە بە کۆت و مەرجی جۆر(النوع)ی سەرمایە دەکەین.

سەرمایەدار لە دیموکڕاسی سەرمایەداری ڕۆژئاوادا، ئامانجی هەرە گرنگ و گەورەی ئەوەیە، کە قازانج بکات، لە یاساکانیشیدا هەموو ئەو توانایانە دادەنێت، کە هەلی قازانج کردنی بۆ دەڕەخسێنن، لە پێش هەموویانەوە بەڕێوەبردنی کار و کردار بە سوو(الربا)، هەروەکو پێشتر باسمان کرد، کە تەنها ئەمە بەسە بۆ زانینی پیسی و چەپەڵی نیزامەکانیان و، کە ئیددیعای دادگەرییان پووچەڵکاتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا بەتەنها سوو(الربا)، تاکە خراپەی نیزامی سەرمایەداری ئازادی نیە!! چونکە ئارەزووی قازانج لەسنورێکدا ناوەستێت و گرنگی بەتێکدانی رەوشتی خەڵك نادات، مادام خراپەکاری لەزەویدا هەلی زیاتری قازانج بۆسەرمایەداری بڕەخسێنێ!!.

دوورخستنەوەی بیرو چەمکی ژیانی دوایی لە بیرو هۆشی خەڵك و، دونیا کردنە گەورەترین وگرنگترین خەم وتاکە مەبەستی هەوڵ بۆ دان و

تێکۆشان، کاری داگیر کردن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵك بە جۆرەها شتی هەڵخەڵەتێنەر، کە دونیایان بۆ دەڕازێنێتەوە، لە کۆتاییدا بەبەرژەوەندی سەرمایەدارەکان کۆتایی دێت.

سەرشێتی(مۆدێلات)بەشێکە لەو شتانەی، کە عەقڵ و دڵ و دەروونی خەڵك تێکدەدات و، لەهەمان کاتدا بە ملیاران ماڵ و سامان دەخاتە گیرفانی سەرمایەداران، کە ئەگەر خەڵکی بۆ ئامانجێك ژیابان و لەژێر چاودێری خودایی بان، حیسابیان بۆ ڕۆژی دوایی کردبا(لە حەشر و حیساب و پاداشت و سزا).

مۆدێلات هەر بە جلی ژنانەوە تایبەت نییە، هەروەکو کە ناوی دێ خەڵکی وا لێی حاڵی دەبن، بەڵکو زۆر جۆری هەن، سەیری مۆدێلاتی ئۆتۆمبێل بکەن ئەگەر خەڵکی، خۆشی دونیا لە ڕۆژی دواییان بێئاگایان نەکات، جیاوازی لە نێوان ئۆتۆمبێلی ساڵی پار و ئەمساڵ چییە؟ئایا ئەندازیاران و داهێنەران لە چیدا داهێنان دەکەن، کە خەڵکی وا لێبکەن واز لە ئۆتۆمبێلی کۆن بێنن و هەوڵی وەدەستخستنی ئۆتۆمبێلی نوێ بدەن؟سەرەڕای ئەو فێڵ و تەڵەکانەی، کە سەرمایەداران دوای جەنگی جیهانی دووەم پەیڕەویان دەکردن، لە وەبەرهێنانی دەزگاو ئامڕازی وا، کە ماوەی کارکردنی دیاریکراو(محدود)بێت، خەڵکی ناچارکەن، کە بەردەوام بیانگۆڕێت، تا کارگە بەرهەمهێنەرەکان قازانج بکەن و بەردەوام ڕەواجیان هەبێت، تەنانەت لە داوو دەرمانیشدا ئەم فێڵ و تەڵەکانە دەکەن و وایان درووست دەکەن، تا بە تەواوی نەخۆشیەکە چارەسەر نەکات، تا کارگەکانی دەرمان لە بەرهەمهێنان و دابەش کردن و قازانج کردن بەردەوام بن!

هەروەها بڵاو کردنـەوەی هۆکارەکـانی ڕابـواردن لـە ژیـانی خەڵکدا، بـە بیانووی ئاسوودەیی دەروونی خەڵك و ماندوبوون دەرکردن و حەسانەوەی زیاترو زیاتر تام و چێژ وەرگرتن!

ئایا ئەمە لەپێناو خوادایە یاخود لە پێناو شەیتان؟ هیچ کـەس نکۆڵی کـاری پیشەسـازی ناکـات، یـاخود ئـەوەی، کـە تـەکنیك لـە پێنـاو خزمـەتی مرۆڤایەتیـدا دەیکـات، ئەگـەر ئـەو هەوڵـە زانسـتی و تەکنیکیانـەو، ئـەو خزمەتگوزاریانـەی، کـە پێشکەشـی خـەڵکی دەکـەن بـەس بوایـەن و، سـەرمایەداران بەوەنـدە قەناعـەتیان کردبـا، کـە بـە حـەڵاڵی لـە بـری ئـەو هەوڵانـە وەری دەگـرن، ئـەوا زۆر لـە سـیفات و خاسـیەتی ئـەو فەسـادی و خراپەکاریـەی دەگـۆڕین، کـە ئـەمڕۆ زەوی داگرتـوەو، دیموکڕاسـی سـەرمایەداری ڕیبـاخۆر پشـتگیری دەکـات، بـە دانـانی ئـەو یاسایانەی، کـە بەڕێگایەکی ڕاسـتەوخۆ، یـان نـا ڕاسـتەوخۆ خـاوەن بەرژەوەندیـەکان هـان دەدات کە فەسادی و خراپەکاری بڵاو بکەنەوە.

****

خاوەنداریەتی تاکەکەسی لە ڕێبازی خوایی دا بەهۆی ئەو شەریعەتەی، کـە لـە لایـەن خـواوە هـاتووە، پـارێزراوە، بـەڵام لەهـەمان کاتـدا ڕێگـری لێدەکات لە خراپەکاری و خراپبوون، بەهۆی ئـەو کۆت و مەرجانـەی، کە بۆی دانـاون تـا لەنێویـدا سـەرمایە گەشـە بکـات، هـەروەها لەهـەمان کاتـدا ئاراستەی خەڵك دەکات بەرەو پەرستنی خواو نزیکبوونـەوە لێـی بـەهۆی پەرستشـەکانەوەو، هەسـت کـردن بەچـاودێری خـوا لەهـەموو گـەورەو بچوکێکدا، والەڕۆژی دوایی دەکات، کـە بـەردەوام لـە دڵـی خەڵکیـدا بـوونی هەبێت.

ئێمە ناڵێین خەڵك لەژێر سایەی ڕێبازی خواییدا دەبنە فریشتەو، جگە لە چاکە هیچی تریان لێنابینرێت!نەخێر!چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤەو لە مرۆڤایەتی خۆی ناشۆرێ. بەڵام جیاوازییەکی زۆریش هەیە لەنێوان کۆمەڵگەیەك، کە پەیڕەوی شەرعی خوا دەکات و، کۆمەڵگەیەك بێ کۆت و مەرجە و، تەنها بەدوای هەواو ئارەزووەکانیدا عەودالە، کە ئارەزووی قازانجیش بەهەر ڕێگەیەك بێت، هەرچەندە ببێتە هۆی تووڕەبوونی خواش، یەکێکە لەو ئارەزوانەو، هەر شتێك دەبێتە هۆی توڕەبوونی خوای پەروەردگار، بیکاتە بنچینەیەك لە بنچینەکانی ژیان!

بێگومان ڕێبازی خوایی ڕێبازێکی تێر و تەواوە، بیرو باوەڕو شەریعەت تیایدا، ئاراستە کراون بۆ دروست کردنی(مرۆڤێکی چاك)، کە لەژیانێکی خۆش و باشدا لەسەر زەویدا بژیت و، لە دوارۆژدا بکەوێتە ناو نازو نیعمەتەکانی خواوە.

﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ القصص: ٧٧. واتە:هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیوی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو، بەشی خۆیشت لەدونیادا بەحەڵاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەی هەوڵی فەسادو گوناه و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت، کە تۆوی خراپە دەچێنن﴿ مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ

﴿فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ النحل: ٩٧ واتە: ئەوەی كارو كردەوەی چاكی كردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، سوێند بەخوا بەژیانێكی كامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژیێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی، كە ئەوان دەیانكرد. هەر بەشێكی ئەو ڕێبازە-شوێنی تایبەتی خۆی هەیە و، تەواو تۆكمە لەگەڵ بەشەكانی تریدا دەیگونجێت، بیر و باوەڕو سیاسەت وئابوری و ڕەوشت.. هەر كامێكیان ڕۆڵی خۆی دەبینێت و لەكۆتاییشدا لەشوێنێكدا بە تێر و تەسەلی بەیەك دەگەن پێی دەگوترێت(پەرستنی خوا). كە هەموو بوارو لایەنەكانی ژیان لەخۆ دەگرێت﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ الأنعام: ١٦٢ - ١٦٣ واتە: بڵێ:بەڕاستی نوێژ و حەج و درووشمەكانی و، ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان. ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریكێكی نییە و من بەوە فەرمانم پێ دراوەو، من یەكەم كەسی موسوڵمانانم.

# دادگەری کۆمەلایەتی لە ئیسلامدا

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :(انتم بنو آدم، وآدم من تراب)رواه الترمذي وابو داود. واتە:ئێوە هەمووتان وەچەی ئادەمن و، ئادەمیش لە خۆڵە.

((المسلمون تتكافأُ دماؤهم ويسعى بذمتهم أدناهم ))رواهابو داود. واتە:خوێنی موسوڵمانان وەکو یەکە، ئاساییترین کەسی موسوڵمان توانای داڵدەدانی هەیە.

((الا لا فضل لعربي على اعجمي، و لا لأبيض على أسود، الا بالتقوى)). واتە:بێگومان عەرەبێك گەورەیی نیە بەسەر کەسێکی غەیرە عەرەب، نە سپی پێست بەسەر ڕەشپێستەوە هەیە، تەنها بە تەقوا نەبێت.

((انما اهلك الذين من قبلكم انهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه، و اذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد. وايم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها))رواه مسلم. واتە:لەناوچوونی گەلانی پێش ئێوە، بەوە بوو، کە ئەگەر خاوەن پایە دزی کردبا، وازیان لێدەهێنا، ئەگەر بێهێزێکیش دزی کردبا، سزایان دەدا، سوێند بە خوا، ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات، دەستی دەبڕم.

((القوي فيكم ضعيف حتى آخذ الحق منه، و الضعيف فيكم قوي عندي حتى آخذ الحق له))واتە:بەهێزتان لای من بێهێزە، تا ماف لێوەردەگرم،

بێهێزیشتان لای من بەهێزە، تا مافی بۆ وەردەگرم. ( ئەمە بەشێکە لە ووتاری ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێبێ)، کاتێك خەلافەتی گرتەدەست).

****

ئەمانەو چەندین نموونەی تر کۆڵەکەکانی دادگەری کۆمەڵایەتین لە ئیسلامدا.

لە ئیسلامدا چینێك نیە، کە تایبەتمەندی وای هەبن، لە چینەکانی تری جیابکاتەوە. لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا وەکو هەموو کۆمەڵگەکانی تر، دەوڵەمەند و هەژار هەن، بەڵام لە ئیسلامدا چینێك نیە وەکو مانای چینایەتی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەکی سادە، ئەویش ئەوەیە، کە لە ئیسلامدا مرۆڤ یاسا دانانێت، هەروەها بەهۆی هەژاری و دەوڵەمەندییەوە، هیچ جیاوازییەکیان نیە لە شەریعەتدا(هەروەکو لە هەموو ئەو نیزامانەدا هەیە، کە مرۆڤ تیایاندا یاسا دادەنێت، ئیتر چینێك لەبەرژەوەندی خۆی لەسەر حیسابی بەرژەوەندی چینێکی تردا یاسا دادەنێت).

ئەم ڕاستییە گەورەیە، ئەوەیە کە یاسادانەر لە ئیسلامدا خوایە نەك مرۆڤ، کاریگەری لەسەر هەموو لایەنەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فیکری.. هتد. ی ژیان هەیە.

لەوانەیە یەکەم جار هەست بەم کاریگەریانە نەکرێت لە بوارە جیاجیاکانی ژیانداو، لەبواری شەریعەتدا، لە هەموو لایەنەکانی تردا ڕۆشنتر دەرکەوێت، بەڵام لەڕاستیدا هەرچەند قووڵتر بچینە ناخی بووارە جیاجیاکانی ژیان، خۆمان بەرانبەر ڕاستییەك دەبینینەوە، کە هەردەم بەرەو ڕوومان دەبێتەوە، کە بەڕاشکاوی پێمان دەڵێت:دادگەری ئا لێرەدایە، چونکە لەلای خواوەیە!

ئەمە ڕاستییەکە، کە هەموو نەفامیەتەکانی مێژوو ئینکاری دەکەن، کە مروڤ تیایاندا لەجیاتی خوا یاسادانان دەگرێتە دەست، جا چ نەفامیەتە کۆنەکان بن یاخوود نەفامیەتی هاوچەرخ.

هەر کاتێك مرۆڤ خۆی کردە خوا و لەجیاتی خوا، ئیددیعای یاسادانانی کرد، ئەوا زوڵم و ستەم سەراپای هەموو بوارەکانی ژیان دادەگرێ، بەئەندازەی دوری یاسای مرۆڤ لە یاسای خوا.

نەفامییەتی نوێ لە ڕۆژئاوادا، گەورەترین نەفامییەتە لە مێژوودا، کە مرۆڤی کردووەتە خوا لەبری خوا، لەبەر ئەوە﴿ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾ الروم: ٤١. واتە:تاوان و خراپە دەرکەوتووەو هەموو سەرزەوی و دەریاکانی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە، کە خەڵکی دەستییان داوەتێ، سەرئەنجام دەبێت تاڵاوی هەندێ لەکردەوەکانیان بچێژن، بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاکی و خواناسی. (الظهور)لێرەدا بەمانای توانایی و بڵاوبوونەوە دێت.

****

پێغەمبەری بەرز و بەڕێز(ﷺ)دەفەرموێت: (انتم بنو آدم وآدم من تراب) الترمذي و ابو داود، واتە:ئێوە وەچەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە.

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)لێرەدا مەبەستی کەمکردنەوەی پلەوپایەی ئینسان نیە، چونکە مرۆڤ ئەو درووستکراوەیە، کە خوالە قوڕی زەوی درووستی کردووە :﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن

طِينٍ ﴾ص: ٧١. واتە:کاتێك پەروەردگارت فەرمووی:من دەمەوێت مرۆڤێك، لە قوڕ درووست بکەم.

هەر هەمان ئەو درووستکراوەیە، کە خوا بەسەر زۆر لە درووستکراوەکانی تریدا بەرزی کردۆتەوە﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ الإسراء: ٧٠. واتەبەڕاستی ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشکانی و دەریادا(بەجۆرەها هۆکاری گواستنەوە)هەڵمان گرتوون و لە ڕزق و ڕۆزی پوخت و چاکی و جۆراو جۆر بەهرەوەرمان کردوون(لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و.. هتد)بەڕاستی ئێمە ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدی هێنراوانەدا، کە دروستمان کردن و(لەهەموو ڕوویەکەوە، تا قەدرو ڕێزی خۆیان بزانن).

بەڵکو ئەم قسەیە بەئاراستەی ئەوکەسانەیە، کە زوڵم و ستەم دەکەن بەبێ حەق و، بیریان دەخاتەوە، کە لەچی درووست بو ون، تا خۆیان بە زل نەزانن و ملکەچی فەرمانەکانی خوابن.

مرۆڤ کاتێك لە بوندا شوێنی ڕاستی خۆی دەزانێت، لە باشترین بارودۆخدا دەژی: کەوا بەندەی خوایەو لەسەر زەوی گەورەیە، ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن بۆی مەیسەر و ڕام کراون: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾ مریم: ٩٣ واتە: هیچ کەسێك نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خوای میهرەبان نەبێت ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ

يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الجاثية: ١٣ واته: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕامهێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێكڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك كە بیر بكەنەوەو، تێفكرن.

نە بەندایەتی مرۆڤ بۆ خوا گەورەیی مرۆڤ لەسەر زەویدا ڕەتدەكاتەوە، نەگەورەیی مرۆڤ لەسەر زەوی بەندایەتی بۆ خوا ڕەتدەكاتەوە. ئیتر كاتێك دەرك بەم ڕاستییە دەكات، دەبێتە ئەو مرۆڤە هۆشیارەی، كە دوو ئایەتەكەی سوڕەتی (الحجرات) مەبەستیانە ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ۝٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ الحجرات: ٧ - ٨. واته: ئێوە دڵنیا بن و بزانن، كە پێغەبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لە ناوتاندایە(پرس و ڕای پێبكەن) زۆر شت هەیە ئەگەر ئەو بەڕای ئێوەی بكردایە تووشی گیرو گرفت و ناخۆشی دەبوون،بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست كردوون و لە دڵ و دەروونتاندا ڕازاندوویەتیەوە.. لەولایشەوە كوفر و بێباوەڕی و گوناه و یاخیبوون لە فەرمانی خوای لا تاڵ و ناشیرین كردوون، ئا ئەوانە هەر خۆیان ڕێگەی ژیری و سەرفرازییان گرتۆتە بەر، ئەمەش خۆی ڕێز و بەخششێكی تایبەتی و نازو نیعمەتێكە لەلایەن خواوە پێیان دراوە، خواش زانا و داناو كاربەجێیە .

مـرۆڤ لـە دوو بارانـدا حـاڵی بـەرەو خراپـی دەچـێت:کاتێـك زاڵمـان و سـتەمکاران بـە کـەمی دەزانــن و دەیکەنــە بەنــدەی خۆیــان و ئــەمیش بەبەندایــەتیان ڕازی دەبێــت، کــاتێکیش خــۆی ســتەم دەکــات و ســنور دەشکێنێ و خۆی دەکاتە هاوبەشێك بۆ خوا، خـۆی دەکاتـە هاوبەشـێك بـۆ خـوا، یـاخود خـۆی دەکاتــە خـوا لـەبری خـوا، ئـیتر لـەجیاتی خـوا یاسـا دادەنێت، پێوانەکان بۆخۆی دادەڕێژێت لەبری خوا، هەر ئەوانەن، کـە بـێ دەسـەڵات کـراون و زوڵـم و سـتەمیان کـردووە، قورئـانی پـیرۆز لـە زۆر لـە ئایەتەکانیــدا کاتێــك حــاڵی نەفامــەکان لـــە دواڕۆژدا دەردەخـــات و لەبارەیانـــــەوە دەفـــــەرموێت:﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَـٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴾ إبـــراهیم: ٢١. واتـــە: (ئـــەو ڕۆژەی کـــە قیامـــەت بـــەرپا دەبێت)هەموان لە بەردەم دەسـەڵاتی خـوادا دەردەکـەون، ئینجا لاوازو بـێ دەسەڵاتەکان (ئەوانـەی کوێرانـە شـوێنی ملهوڕ و سـتەمکاران کـەوتبوون) دەڵێن بەوانـەی، کـە خۆیـان بـە زل و گـەورە دانـابوو، بێگومـان خـۆ ئێمـە شوێنی ئێوە کەوتبووین!(ئێمە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئێـوە بـووین!)، جا ئایا ئێوە ئـەمڕۆ نـاتوانن هـەوڵێك بـدەن، تـا ئەندازەیـەك سـزای خـوا لەسـەرمان کـەم ببێتــەوە، لـە وەڵامیانـدا ووتیـان:ئەگـەر خـوا هیدایـەتی ئێمەی بدایە، ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان دەدا، (ئەڵبەت ڕوون و ئاشکرایە، کە ئەوانە بە دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتیانەوە لە دونیادا، نـەك هیدایـەتیان نەدەویست، بـەڵکو دژی دەوەسـتان و پیلانیـان دەگێـڕا، ئـیتر چـۆن خـوای

گەورە هیدایـەتی ئـەو جـۆرە کەسـانـە دەدات، خـۆ هیدایـەت بـە زۆر نیـە)
ئێستاش بۆ ئێمە چوونیەکە، هـاوارو ئـاە و نـاڵـە بکـەین، یـان دان بـەخۆدا
بگرین، چارمان نیەو ڕزگار بوونمان ئەستەمە﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن
نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ
عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ
ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ
أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ
وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ سبأ: ٣١ - ٣٣. واتـە:ئەوانـەی
بێ باوەڕ بون ووتیان: هەرگیز باوەڕ بەم قورئانەو بەو هەواڵەش ناکـەین،
کـە باسـی دەکـات(کـە قیامەتـە)، خـۆ ئەگـەر دەبینیـت کاتێـك ستەمکاران
وەستێنراون لەبـەردەم دادگـای پەروەردگاریانـدا قسـە دەڵێن بـە یـەکتر و
یــەکتری تاوانبــار دەکــەن، بــێ دەســەلاَت و لاوازەکــان بــە زۆردار و
دەسەلاَتدارەکان دەڵێن:ئەگەر ئێوە نەبوونایەتە کۆسپ، ئەوا ئێمە باوەڕدار
دەبـووین. دەســەلاَتدارو زۆر دارەکـانیش بــەلاوازکراو و ژێــر دەســتەکان
دەڵێن: ئایا بۆچی ئێمە ڕێگەی هیدایـەتمان لێبەستبوون و نەماندەهێشت
دوای ئەو کاتەی، کە هیدایەت هاتبوو بۆتان؟! نەخێر، وانیـە، بـەڵکو ئێوە
خۆتان تاوانبار و تاوانکاربوون. دووبارە لاوازکراو و ژێر دەستەکان ووتیان
بـە زۆردار و ژێـر دەسـەلاَتدارەکان:نـا، وانییـە، بـەڵکو پـیلان و نەخشـەی

شـــەوانە و ڕۆژ بـــوو كاتێـــك فـــەرمانتان پێـــدەداين، بڕوامـــان بـــەخوا نەبێت(شوێنی ڕێگاو ڕێبازی نەكەوين)، هاوەڵی بۆ بڕيار بدەين، (پاشان هەمووان)پەشيمانی لە دەروونيانـدا دەشارنەوە، بەتايبـەتی كاتێك سزاو تۆڵەيان بينی بۆيان ئامادەيە، ئێمەش چەندەها كۆت و زنجيری ئاگرينمان كردە گەردنی ئەوانەوە، كە بێ بـڕوا بـوون، ئايا پاداشـت دەدرێنـەوە جگـە لـەوەی، كـە دەيـان كـرد؟. ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾ غـافر: ٤٧ - ٤٨. واتــە:ئـەو كاتــە ئــيتر شــەڕو كێشــە دەستپێدەكەن لەناو ئاگری دۆزەخدا، لاواز و چەوساوەكان بـە دەسـەڵاتدار و لووت بەرزەكان دەڵێن:خۆ بەڕاستی ئێمە شوێنكەوتەی ئێوە بووين، ئايا ئێـوە نـاتوانن تۆزێـك سـزای ئاگرمـان لەسـەر كـەم بكەنەوە؟لـە وەڵاميانـدا لووت بەرزەكان دەڵێن :ئێمـە هـەمووومان لـەناو ئـاگردا گيرمـان خـواردووە، بێگومان خوای گەورە داوەری كردووە، لەنێوان بەندەكانيـدا و بڕيارەكـانی بڕاوەتەوە.

لەهـەموو نەفاميەتـەكانی مێـژوودا، كەسـانێك هـەبوو ون، كـە ياسـاو شەريعەتيان داناوەو، كەسانێكيش هەبوو ون، كە ملكەچی ياساكانی زاڵمان بو ون، نەفامی هاوچەرخيش لەم حوكمە بەدەر نيـە، تـەنها لەيـەك شـتدا لەوان جياوازە، ئەويش ئەوەيە، كـەوا دەزانرێـت پيـاوی سەرشـەقام (رجل الشـارع)، ياسـاو شـەريعەت دادەنێـت و هەرئـەوە، كـە حـوكم دەكـات و

خەڵکیش بەڕاستی دەزانـن!لەکاتێکـدا ئـەوەی حـوکم دەکات، سـەرمایەیەو هەموو کارەکان بە ئارەزووی ئەو هەڵدەسووڕێن!

تـەنها لـە ئیسلامدا مـرۆڤ لـە حـاڵێکی باشـدا دەبـێ، چونکە لەشـوێنی تەواوی خۆیدا دەبێت بە بەندەی خوا، گەورەی زەوی‌بەو ئەندازەیەی، کە خوا مافی گەورەیی لە زەویدا داوەتـێ‌و، هەرچی لـە ئاسمانـەکان و زەویـدا هـەن بـۆی مەیسـەر کـردوون، تـا بتوانێـت بـەو کـارەی هەڵبسـتێ، کـە جێنشینایەتی خوایە، کاتێك خوا بە فریشتەکانی فەرموو:من جێنشینێك لــە زەویــدا دادەنــێم ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٣٠ واتە: کاتێـك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو:بەڕاسـتی مـن دەمـەوێت لـە زەویـدا جێنشینێك دابنێم.

هـەموو ئەوشـتانەی، کـە پێویسـتن بـۆ گێڕانـی ئـەم ڕۆڵـە بـۆی دابـین کــردوون﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحــل: ٧٨ واتــە: خــوا ئێوەی لە سکی دایکتـان دەرهێنـاوە بـێ ئـەوەی هـیچ شـتێك بـزانن، ئینجا دەزگـای بیسـتن و بیـنین و تێگەیشـتنی بـۆ دابـین کـردوون، بـۆ ئـەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

خەڵکی نەفامی نوێ، لەهەموو کەس لەپێشترن کە ئەم ڕاستییە بـزانن، کـە لـەبیری ئەوانـدا وون بـووەو، لـە هـەمان کاتـدا دەبـێ بـزانن، کـە لـە

ئیسلامدا نەبێت بەدەستیان ناکەوێت و، بزانن کە لە گەورەترین سیماکانی ئیسلامە.

****

پێغەمبەرمان(ﷺ)، فەرموویەتی:(المسلمون تتكافأ دماؤهم، ويسعى بذمتهم أدناهم. (أبو داود). واتە:مسوڵمانان خوێنیان هاوتا و یەکسانە، ئاساییترین کەسی موسوڵمانان مافی داڵدەدانی هەیە.

هەموو کەس لە تەرازووی ئیسلامدا یەکسانن، نە ڕەگەز، نە نەتەوە، نە ڕەنگ، نە زمان، نە شوێن، پێوەری گەورەیی و سەروەری نین لە ئیسلامدا، بەڵکو تاکە پێوەری گەورەیی پارێزکاری(التقوى)یە، (سەروەریو گەورەیی بۆ عەرەب نیە بە سەر غەیرە عەرەب و، نە سپی بەسەر ڕەشدا، تەنها بە تەقوا نەبێت). ئەم مەفهومە لەو سەردەمەی کە ئیسلام وەکو خۆی جێبەجێ دەکرا-تەنها درووشمێك نەبوو، کە لە ڕاستیدا بوونی نەبێت، بەڵکو ڕاستیەکی بەرجەستە بوو، کە هەموو خەڵك بەچاو دەیاندیت. عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لەسەربێت) دەڵێت:(ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لەسەربێت) گەورەمانەو، گەورەمانی ڕزگارکردووە!)ئەوە کێیە کە عومەر(ڕەزای خوای لەسەربێت) بە گەورە ناوی دەبات؟بیلال(ڕەزای خوای لەسەربێت)ە، بەندەی ڕەشی حەبەشی!عومەری عەرەبی قوڕەیشی و یەکێ لەسەردارانی قوڕەیش، دەربارەی بیلال گوتوویەتی(گەورەمان بیلال!)، ئایا ئەمە لوتکەی دادگەری کۆمەڵایەتی نیە؟ ئایا نموونەی وەکو ئەمە جگە لە ئیسلام-کاتێك کە وەکو خۆی جێبەجێ دەکرا-لە مێژوودا هەیە؟!

مسوڵمانان خوێنیان هاوتایە و، ئاساییترین کەسی مسوڵمانان مافی داڵدەدانی هەیە.. لەبری هەموو ئوممەت قسە دەکات، پەیمانی لە جیاتی

دەبەستێت و، کارەکان توند و تۆڵ دەکات کاتێك ئوممەت پێویستی پێیەتی، بێ گرنگیدان بەرەچەڵەك و ڕەنگی پێستی، یاخوود هەژاری و، هیچ لەو دەستەواژانە، کە پێگەی خەڵك لە نەفامیەتەکان(الجاهليات)دا دەردەخات.

کێ بوو کە پێغەمبەر(ﷺ)کردبوویە سەرکردەی سوپا، کاتێك کە پێش ئەوەی سوپاکە وەرێ کەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد؟ ئوسامەی کوڕی زەید(ڕەزای خوای لەسەربێت) تەقوا وای بەرز کردەوە، کە سەرکردایەتی هاوەڵە بەرزو بەڕێزەکانی بکات ((ڕەزای خوایان لەسەربێت). ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لەسەربێت) خەلیفەی موسوڵمانان، داوای ئەوەی لێدەکات، کە عومەر یەکێك لە سەربازانی سوپا بهێڵێتەوە، تا لە کاروباری خەلافەتدا یارمەتی ئەبوبەکر بدات، پێی دەڵێ:(ان رايت ان تعينني بعمر فافعل!!).

ئەم گەورەییە لە مێژوو ڕوینداوە، تەنها لە ئیسلامدا ڕویدا، ئەو ڕۆژەی، کە ئیسلام وەکو خۆی پیادەکرا!

****

خەلیفەی یەکەمی مسولمانان ئەبوبەکری سددیق(ڕەزای خوای لەسەربێت)گووتویەتی: (القوي فيكم ضعيف حتى آخذ الحق منه، الضعيف فيكم قوي عندي حتى آخذ الحق له) واتە:بەهێزتان لای من بێهێزە، تا مافی لێوەردەگرم، هەروەها بێهێزتان لای من بەهێزە، تا ماف بۆ وەردەگرم.

ئەمەش گەورەییەکی تری ئیسلامە لەلایەنێکی ترەوە.. لایەنی دادوەری.. لایەنی ماف خەڵك لە بەرانبەر یەکتری.

پێشتریش پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی، کاتێـك ئوسامە چووە لای، تـا بۆ ژنێك شەفاعەت بکات کە دزی کردبوو، پێی فەرموو:(ئایا بۆ سـنوورێك لە سنوورەکانی خوا شـەفاعەت دەکەن)؟ بەهیلاکـەت چوونی قەومـەکانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەبوو، کە ئەگەر گەورەکان و پایەداران دزیـان کردبـا وازییـــان لێـــدەهێنان، ئەگـــەر بێهێـــزیش دزی کردبـــا، ئـــەوا حـــەددیان لێـدەردەکرد. سـوێند بەوکەسـەی گیـانی موحەممـەدی بەدەسـتە، ئەگـەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات، دەستی دەبڕم.. (مسلم).

لە هەندێ نەفامیدا، کـە لایـان وایـە پایـەدارترین ئاستە، کـە تـا ئێستا مرۆڤایەتی پێی گەیشتبێت، ملیۆنێرەکان بە ملیۆنـان پـارە دەدزن، کەچی یاسا بۆیان دەشارێتەوە، چونکە دەزانـن چۆن زاری ئـەو کەسـانە ببەسـتن، کە ئاگاداری دزیەکەیانن،، تـەنها ئەگـەر ملیۆنێرەکـە کارێکی وا بکـات، کـە نەتوانرێت بۆی بپۆشرێت، ئیتر دەست لـەکار دەکێشـێتەوە ئەگـەر خـاوەن دەسەڵاتێك بێت، (یان وای لێ دەکرێ کەدەست لـەکار بکێشـێتەوە)و، ئـەو ملیۆنانەی، کە دزیویەتی هەر بۆ خۆی دەمێنێتەوە .. کەم وایە دەستکاری بکرێت! لەهەمان کاتـدا یاسـا زۆر بـە تونـدی بەسـەر ئـەو دزەدا جێبـەجێ دەکرێـت، کـە چـەند دینـارێکی دزیـوە! جـا ڕۆژنامـەکان لـەژێر ناونیشـانی (ئابرۆچـوونی... ) هەواڵەکـەیان بـڵاو دەکەنــەوەو، ماوەیــەك لەبەرچـاوان وون دەبن و دواتـر دەگەڕێنەوە!

★★★★

لەو کۆمەڵگایەی کە ئیسلامی وەکو خـۆی-کـەخوا ناردوویەتیـە خـوارێ- تێـدا جێبــەجێ دەکرێــت، خــەڵك هــەموویان لەبەرانبــەر شــەرعی خــوادا بەیەکسانی دەوەستن. ئەم نموونەیەی مێـژوو وەرگـرە. عـەلی کـوڕی ئـەبو

تالیب(ڕەزای خـوای لەسـەربێت) قەڵغانەکـەی وون کردبـوو، دواتـر لـەلای جولەکەیـەك دۆزییـەوە و، لەگـەڵ کابرای جولەکـە چـونە لای شـورەیحی دادوەرو، سکاڵای خۆی پێشکەش کـردوو گـووتی:قەڵغانەکـە قـەڵغانی منـەو نەفرۆشتوومە، نە بەخشیومە. دادوەریـش ڕووی لەجولەکەکـە کردووپێـی گوت: دەربارەی قسەکانی ئەمیری موسوڵانان چی دەڵێی ؟ گـوتی: قـەڵغان قـەڵغانی منـەو ئـەمیری ئیمانـدارانیش بـەدرۆ نـازانم (وەکـو عـادەتی هەمیشـەیی جولەکـەکان کـە گۆچـان لـە ناوەڕاسـتدا دادەگـرن!)دادوەریـش گـووتی:شایەتت هەیە؟عـەلیش(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)گـووتی:شـورەیح ڕاست دەکات چونکە مـن هـیچ بەڵگەیـەکم نیـە! ئـیتر دادوەر حـوکمی بـۆ جولەکەکەدا، کە قەڵغانەکە هـی ئـەوە، بـەپێی کارکردن بـەو بنچـینەیەی، کە دەڵێت(لەلابوون(پێ بوون)سەنەدی خاوەندارییەتیە!).

ئـیتر جولەکەکـە قەڵغانەکـەی بـردو، چـەند هـەنگاوێك دوور کەوتـەوە، پاشان گەڕایەوەو گوتی:ئـەمیری ئیمانـداران لـەلای دادوەری خـۆی حـوکمی بەسـەردا دەدرێـت؟!بەڕاسـتی ئـەوە ڕەووشـتی پێغەمبەرانـە!ئینجـا گـووتی:(اشـهد ان لا الـه الا الله واشهد ان محمـدا رسـول الله)! پاشـان گـووتی ئەی ئەمیری ئیمانداران قەڵغان قەڵغانی تۆیـە، هیچـم دەسـتنەکەوت بۆیـە ئەوەم برد، پاشان عەلی(ڕەزای خوای لەسەربێت)، پێی گوت:مـادام ئیسـلام بوویت، ئەوە بۆتۆبێت!.

ئەوەی شایەنی ئەوەبێت، کە دەرسی لێوەربگیرێـت، تـەنها ئـەوە نـەبوو کـە عـەلی(ڕەزای خـوای لەسـەربێت) ئـەمیری ئیمانـداران و فەرمانڕەوایـە، بەزۆرەملێ قەڵغانەکەی وەرنەگرتەوە، لە کاتێکدا کە دڵنیا بوو هـی ئـەوەو جوولەکەکە دزیویەتی، یـاخود ئـەوە، کـە عـەلی(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)

پەنای بردۆتە بەر دادگا، تا مافی خۆی وەربگرێتەوەو، دواتر دادوەر بە دژی ئەو حوکم دەکات(سەرەڕای ئەوەی، کە دادوەر دڵنیا بوو عەلی(ڕەزای خوای لەسەربێت)لە سکاڵاکەی ڕاستگۆیە)، بەڵکو لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەبوو، کە ئەو کەسەی دزییەکەی کردبوو جوولەکەبوو، نەوەکو موسوڵمان.. ئەمە ئەوپەڕی گەورەییە!چونکە جوولەکەکان ئەوەی پێیان کرا دژی ئیسلام کردیان، چەندین پیلانیان لە دژی ئیسلام گێڕا، تا کار گەیشتە ئەوەی، کە ژەهر بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تێبکەن، هەروەها هەوڵیاندا لەسەرەوە بەردی بەسەردا بدەن(تا جبریل(علیه السلام)) ئاگاداری کردەوەو، پێش ئەوەی ئەمە ڕوو بدات لەشوێنی خۆی هەستا)، سەرەڕای ئەو مێژووە ڕەشە، عەلی(ڕەزای خوای لەسەربێت)بیری لە تۆڵە سەندنەوە نەکردەوەو بۆوەرگرتنەوەی مافێکی، کە دڵنیا بوو لێی، هێزی بەکار نەهێنا، بەڵکو پەنا دەباتە بەر دادگاو، ئەویش پشتگیری ناکات و، مافە زەوت کراوەکەی بۆ ناگێڕێتەوەو، دەڵێت جولەکەکە ڕاست دەکات، من هیچ بەڵگەیەکم نیە!

ئەمە لەگەڵ حاڵی موسوڵمانان لە(گوانتانامۆ)بەراوورد بکە، کەئەگەر سەیری هۆکاری بەندکردنیان بکەین، لەوانەیە تەنها ئەوە بێت لە دوور، یان نزیك بەشدارییان لەتاوانێکدا کردبێت، کە لەهەموو لایەکەوە پیلانی بۆ کێشراوە! دواتر سەیری کاری لێکۆڵینەوەبکە کاتێك، کە دەیانەوێت بەزۆری وایان لێبکەن، کەدان بەتاوانەکەیاندا بنێن و، پارێزەریان بۆ نەگیرێت یان نوێکردنەوەو تێهەڵچوونەوەی ئەو حوکمانەی، کە دەرهەقیان دەردەکرێ!

****

ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ ڕەفتاری چاك لەگەڵ خاوەن کتێبەکان(أهل الکتاب)، ئەگەر دژایەتی ئیسلام نەکەن. خوای بەرزو توانا دەفەرموێ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الممتحنة: ٨ واتە: خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات، کە چاك ڕەفتار و دادپەروەری بکەن، لەگەڵ ئەو کەسانەدا، کە جەنگیان دژ نەکردوون و، دژایەتی ئاینیان نەکردوون و، لە زێد و وڵاتی خۆتان دەریان نەکردوون. ﴿ وَلَا تُجَـٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ ۖ وَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَـٰهُنَا وَإِلَـٰهُكُمْ وَٰحِدٌ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾ العنکبوت: ٤٦. واتە:موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکاندا، مەگەر بە جوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان، کە ستەمیان کردووە(ئەوە ڕەفتارتان لە بەرانبەریان دەبێت جیاوازبێت)پێشیان بڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمەو ئێوە دابەزێنراوە، خوای ئێمەو خوای ئێوە تەنها یەکێکە، ئێمە فەرمانبەردارو ملکەچی ئەو زاتەین.

بەڵکو بازنەی خۆشەویستی نێوانیان (موسوڵمانان و خاوەن کتێبەکان)ئەوەندە فراوان بووە، کە بووەتە پەیوەندییەکی گەرم و گوڕ و دۆستایەتیەکی پتەو، بەبێ کۆت و مەرج ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَـٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَٱلْمُحْصَنَـٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ

مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ المائدة: ٥. واتە: لەمڕۆوە هەرچی خۆراکی چاك و پاکە بۆتان حەلاڵ کراوە و خواردنی ئەوانەی، کە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاك لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن پاك لەوانەی کتێبیان پێدراوە پێش ئێوە(بۆتان حەڵاڵە)کاتێك مارەییان پێبدەن، بەمەرجێك ئێوە پاك داوێن بن و داوێن پیس نەبن بەئاشکرا دوورە پەرێزبن لە دۆست گرتنی نهێنی بۆ داوێن پیسی.

لەبەرئەوە ئەهلی کیتاب زۆر بە دڵنیایی و ئارامیەوە دەژیان، بێ ئەوەی کەس ڕێ بە چالاکیەکانیان بگرێت، چ بیروباوەڕو چالاکیەکانیان بن، یان چالاکیەئابووری و کۆمەلأیەتیەکانیان بن، هیچ کەس دەستی نەدەخستە ناو کارە تایبەتیەکانیانەوە، سەرەڕای ئەوەی، کە بیروباوەڕیان جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ بیروباوەڕو پەرستشەکانی موسوڵمانان، هەروەها کەس لەسەریان پێویست (فرض)ناکات، کە هیچ لە کلتور و شێوازی ژیانیان بگۆڕن، تا لەگەڵ کۆمەلگەی موسوڵماندا بگونجێن.

مێژوو باس دەکات، کە جوولەکەکان، بە چ شێوەیەك لەلایەن خاچپەرستانی ئەوروپاوە، بەهۆی ئەو بیروباوەڕەیان دەچەوسێنرانەوە، کە لایان وایە ئەوان مەسیحیان لە خاچ داوە! بۆیە شوێنێکیان نەبوو، کە لەژێر سایەیدا بحەسێنەوە، تەنها دەوڵەتی ئیسلامی ئەندەلوس نەبێت، تا ئەو کاتەی موسوڵمانان لە ئەندەلوس وەدەرنران و، خاچپەرستان ئەو قەسابخانەیەیان لەوێدا بۆ موسوڵمانان وەگەڕخست، دواتر جولەکەکان

لەگەڵ ئەوان وەدەرنران و چونە وڵاتی مەغریب و، تا ئێستاش هەر لەوێدا دەژین.

ئەمە بەراوورد بکە لەگەڵ ئەو ڕەفتارەی، کە ئەورووپای خاچپەرست لەدژی ئافرەتە باڵا پۆشەکاندا دەیکات، سەرەڕای ئەوەی، کە باڵاپۆشی بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامی و ئایینی ئیسلام، دەبینین، کە چۆن هات و هاواری خاچپەرستان بەرزدەبێتەوە بۆ وەدەرنانی موسوڵمانان، یاخود ناچارکردنیان بە وازهێنان لە کلتور و، داب و نەریتیان، تا لەگەڵ کۆمەڵگەی ڕۆژئاوادا بگونجێن!

سەیری ئەم دادگەریەکە، کە دیموکراسی ڕۆژئاوا بۆ مرۆڤایەتی دابین کردووە!!.

## دادگەری ئیسلام لە نێوان هەردوو ڕەگەزی ( نێر و مێ )دا

﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ ﴾ آل عمران: ١٩٥. واتە:ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی نزاکانی دانەوە، فەرمووی:بێگومان من زایە ناکەم کردوەی هیچ خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە لە نێر یان مێ، هەندێکتان لە هەندێکی ترتان بووون ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ النحل: ٩٧. واتە:هەرکەس لە نێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێ و بڕواداریش بووبێت، ئەوا سوێند بەخوا، بە ژیانێکی خۆش دەیانژیێنین و سوێند بێ پاداشتیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی، کە ئەوان دەیانکرد .

یەکسانی ڕەگەزی نێر و مێ لە مرۆڤایەتیدا لە کتێبی خوادا(قورئان)، زۆر باش ڕون و ئاشکرایە، دەتوانین بڵێین، کە ئەوەی لە قورئاندا لەم بارەیەوە هاتۆتە خوارێ، یەکەم بڕیار بوە لەبارەی یەکسانی هەردوو ڕەگەز لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەمەش دوانزە سەدە بەر لەوەی ئەوروپا بەلای ئەو بابەتەوە بچێ!ئەوکاتەی ئەوروپیەکان پرسیاریان دەکرد:ئایا ئافرەت ڕۆحی هەیە یان نا؟! ئەگەر ڕۆحی هەیە ئایا ڕۆحێکی ئاژەڵییە،

یان مرۆڤی (انسانی)؟ئەگەر ڕۆحەکەی ڕۆحێکی مرۆڤییە، ئایا لە هەمان پلەی پیاودایە، یان لە پلەیەکی کەمتردایە؟!

چەندان سەدە پێش ئەمانە هەمووی، خوای پەروەردگار لە قورئاندا ئەوەی ڕوون کردبووەوە، کە لە هەمان بنچینەو ڕەگەز و هەمان پلەی مرۆڤایەتیـــــدان﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: ١. واتە:ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن، لە سزای پەروەردگارتان، ئەوەی کە درووستی کردوون لە یەك کەسەوە، کە (ئادەم)ە، هەر لە ئەویش هاوسەرەکەی درووست کردووەو بڵاوی کردۆتەوە، لەو دووانە پیاوانی زۆر هەروەها ئافرەتان، خۆتان بپارێزن لەو خوایەی، کە بەناوی ئەوەوە داوا دەکەن لە یەکتر، خۆتان بپارێزن لە پچڕاندنی خزمایەتی .

هەروەها هەمان ئەرکی پێسپاردوون﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴾ النساء: ٣٦. واتە: بەس خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بە هاوبەشی، هەروەها لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن، لەگەڵ خزم و نزیکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسێی خزم و هاوسێی بێگانە، یا دوور و هاوڕێی هەمیشەیی یا هاوڕێی سەفەر و

ڕێبوار و ئەوانەی بوون بە موڵکتان چاك بن لەگەڵیاندا، بەڕاستی ئەو کەسەی کە خۆبەزلزان و شانازیکەر بێ خوا خۆشی ناوێت .

هەمان بەڵێنیشی پێداون، کاتێك کە بەم کارە هەڵدەستن﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ النساء: ١٢٤. واتە: کەسێکیش کردەوە چاکەکان جێبەجێ بکات لەنێر یان لەمێ، لەهەمان کاتدا ئەو کەسە بڕواداربێت، ئەوا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو، بچووکترین ستەمیان لێ ناکرێت، گەر هێندی توێکڵی ناوکە خورمایەك بێت .

هەمان کاریشی لەسەر پێویست کردوون﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ النور: ٣٠. واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ))! بە پیاوانی ئیماندار بڵێ چاوی خۆیان لە سەیرکردنی نامەحرەم دانەوێنن و بپارێزن، عەورەتیشیان لە داوێن پیسی بپارێزن، ئەوە چاکتر و پاکترە بۆ ئەوان، بێگومان خوا ئاگایە بەهەموو کردەوەیەك کە دەیکەن﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ النور: ٣١. واتە: بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ چاویان دانەوێنن و بپارێزن لە سەیر کردنی نامەحرەم، عەورەتیان لە داوێن پیسی بپارێزن . هەمان سزاشی بۆ ئامادەکردوون، لەکاتی کردنی هەمان تاوانـدا:﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة: ٣٨. واتە: پیاو و ئافرەتی دز

دەستیان ببڕن، لە تۆڵەی ئەو دزییەی کردوویانە، ئەمە تۆڵەو تەمێکردنێکە لەلایەن خواوە، خوا بالآدەست و کاردرووستە﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ ﴾ النور:٢ واتە: ژن و پیاوی زیناکەر، هەریەکیان سەد دار(شەلاق)یان لێ بدەن، لە جێبەجێکردنی فەرمانی خوادا بەزەییتان پێیاندا نەیەتەوە.[١]

نەفامییە کۆنەکان(الجاهليات القديمة) هەموویان سزایان لەسەر ئافرەت توند دەکرد، کاتێك کە هەڵەیەکی دەکرد، بەلآم چاوپۆشیان لە پیاو دەکرد، کاتێك کە هەمان هەڵەی دەکرد، لەسەر ئەو بنەمایەی، کە ئافرەتی زیناکار شوێنەواری تاوانەکەی لە جەستەیدا هەڵدەگرێ و، دواتر دەبێتە جێگای شەرمەزاری بۆ خزم و کەسی و، تێکەڵ بوونی ڕەچەڵەك، بەلآم ئەمە لە پیاودا ڕوونادات. دەکرێ بەهۆی بۆچوونێکی لەم جۆرەش بێت، کە ناوی ئافرەتی زیناکار لەپێش ناوی پیاوی زیناکارەوە هاتووە لەسورەتی(النور)دا، لەکاتێکدا ناوی پیاو لەهەموو بۆنەکانی تردا، چ بۆ مەتح کردن بێت، یان بۆ زەم کردن، هەر پێش خستراوە ﴿ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ التوبة: ٦٧ واتە:پیاوانی دوو ڕوو و ئافرەتانی دووڕوو هەندێکیان لە هەندێکیانن، فەرمان دەکەن بە خراپەو، جڵەوگیر دەکەن لە

---

[١] ) لە بەشی داهاتوودا باسی سەپاندنی سزا بەوجۆرەی پەروەردگار دایناوە دەکەین.

چاکه و دەستیان دەقووچێنن، خوایان لەبیرچۆتەوە، بۆیە خواش ئەوانی فەرامۆش کردن و وازی لێهێناون، بەڕاستی دووڕووەکان هەرئەوانەن، کە لە سنوور دەرچوون.

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ التوبة: ٧١ – ٧٢.. واتە:خاوەن ئیمانەکان ژن و پیاویان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن و یەکتریان خۆش ئەوێ. ئەمر ئەکەن بە چاکە و نەهی ئەکەن لە خراپە و، نوێژ ئەکەن و زەکات ئەدەن بەگوێی فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا ئەکەن. ئەمانە خودای گەورە ڕەحمیان پێدەکات. خوا غالبە بەسەر کاری خۆیدا و کارەکانی پڕ حیکمەتن. خودا بەڵێنی داوە بە خاوەن ئیمانەکان لە پیاو و لە ژن بەچەند بەهەشتێ، کە جۆگا بە ناویاندا ئەڕوا و، هەتا هەتایە تیایاندا ئەمێننەوە، هەروەها بەچەند ڕێگا و جێگاو خانوی جوان و پاك لە جەنناتی عەدندا، لەگەڵ ڕەزامەندی خودای گەورە، کە گەورەترە لە هەموو پایەیەك، ئەوە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەیە.

بەڵێ.. بەڵام دادگەری خوا قەبووڵی ئەوە ناکات، کە ئافرەت سزایەکی توندتری هەبێت لە پیاو، لەکاتی ئەنجامدانی هەمان تاواندا، چونکە

پاڵنەری تاوانەکە لە دەروونی هەردوو ڕەگەزدا، هەرهەمان پاڵنەرە و سزا بەسەر ئەو پاڵنەرەدا دەسەپێنرێ، بەچاوپۆشین لەو شوێنەوارانەی، کە بەبێ ویست لێی دەکەونەوە.

بەڵام نەفامی نوێ لە ڕۆژئاوادا، یاخود ئەو کەسانەی، کە بەفیتی ئەوان هەڵدەسوڕێن و هەڵگری ناسنامەی ئیسلامین، لە پیاوان و ئافرەتان، دەڵێن سزای ئافرەت و پیاو لە کۆمەڵگادا زوڵمە و دەبێ نەمێنێت و، لە بەرانبەردا بە یەکسانی مافی فەسادی و خراپەکاری بە هەردوو ڕەگەز بدرێ و سزا لەسەر هەردوکیان هەڵگیرێ بۆ وەدیهێنانی دادگەریی!!

بەڵێ.. دەبێ جیاوازی سزای پیاو و ئافرەت لەسەر ئەنجامدانی هەمان تاوان هەڵبگیرێت، بەڵام ئەوەی، کە سزا لەسەر خراپەکاران هەڵبگیرێت، تا لە مافی فەسادی و خراپەکاریدا یەکسان بن، تا ئێستا بەدرێژایی مێژوو کەسێك ئەمەی نەگوتووە، جگە لە نەفامییەتی نوێ، کە پێشڕەوی دەکات و گەلی شەیتانیش لە ناخیدا ئەم مانایە قووڵتر دەکاتەوە!!

****

دوای یەکسان بوونی پیاوو ئافرەت لەو هەمووو بوارانەی، کە پەیوەستن بە گەشەسەندن و چارەنوس، خوای پەروەردگار لە کارو فرماندا جیاوازی خستۆتە نێوانیانەوە، کە هەندێ کاری تایبەت کردوون بە ئافرەت، کە پیاو بەپێکهاتەی ئەوەی بە پیاو دروست بوە ناتوانێ بەکاری ئافرەت هەڵسێ، هەروەها هەندێ کار و فەرمانی تایبەت کردوون بە پیاو، کە ئافرەت بۆ ئەم کارە دروست نەبوە و بۆ ئەم ساز نەبوە. بەڵام نەفامی نوێ(الجاهلیة المعاصرة)ئیددیعای ئەوە دەکات، کە ئافرەت توانای ڕاپەڕاندنی ئەم جۆرە کارانەی هەیە، ئەگەر هەلی وەکو پیاوی بۆ

برِەخسیّ، بەلاّم زانست بەشێکی گەورەی ئەم قسەیە بەدرۆ دەخاتەوەو، بەشەکەی تریشی بەهۆی ئەزموونی ڕۆژئاواییەوە چەندین ساڵە وەدرۆ خستراوەتەوە، لەڕۆژهەلاّتیشدا بەهەمان شێوە، کە ڕۆژئاوا بە چەمك و بیرۆکەکانی دەستی بەسەردا گرتووە.

بەرلەوەی بەدرێژی لەوبارەیەوە بدوێین و، حیکمەتی خوای کارزان لە درووست کردنی پێکهاتەیەکی زیندووی _بایۆلۆجی و فسیۆلۆجی بۆ هەریەك لە پیاو و ئافرەت، کە لەگەڵ ئەرك و فەرمانەکانیان گونجاوبێت بەدیاربخەین، سەرەتا دەڵێین، کە جیاوازی ئەرك و فەرمانەکان هیچ پەیوەندییەکی بە یەکسانی مرۆڤایەتییەوە نیە، هەرچەندە جیاوازی زۆریشی لە واقیعی ژیاندا لێبکەونەوە. چونکە ئەو کرێکارەی، کە بە دەستەکانی کار دەکات، لەڕووی ئەرك و فەرمانەوە جیاوازییەکی گەورەی هەیە لەگەڵ بیرمەندێك، کە بە بیرۆکەکانی کێشەکان چارەسەردەکات، یان لەو پزیشکەی، کە چارەسەری نەخۆشەکان دەکات، یاخود لەو ئەندازیارەی، کە ئەرکی درووستکردنی بیناکان دەگرێتە ئەستۆ، یاخود لەو وەزیرەی، کە لەکاروباری دەوڵەتدا بەشداری دەکات، یاخود لەو سەرۆکەی، کە سەرکردایەتی دەوڵەت دەکات، ئایا ئەمانە هەموویان وا لە کرێکارەکە دەکەن، کە لەڕووی پلەی مرۆڤایەتییەوە کەمتر و بێرێزتر بێ لەو کەسانە؟! یان ئایا پێویستە هەموو خەڵك پزیشك و ئەندازیار و بیرمەند و وەزیر و سەرۆك بن، تا لە مرۆڤایەتیدا یەکسان بن؟!بە دەستەواژەیەکی تر:ئایا کار و فرمان ئاستی مرۆڤایەتی مرۆڤ دیاری دەکەن؟!

نموونەمان بۆ جیهانی پیاوان هێنایەوە، دوور لەو حەساسیەتەی، کە لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا هەیە لەسەر دیاریکردنی ئەرك و فەرمانی هەر یەکێکیان، کە بۆخۆی دایناون تا ڕایان پەڕێنێت، هەروەها دوور لەو تەوژمە پیس و چەپەڵەی، کە تووشی زۆر خەڵك هاتووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دەربارەی((یەکسانی تەواوی پیاو و ئافرەت لەهەموو بوارەکاندا))!

خوای کاربەجێ ویستوویەتی هەردوو ڕەگەزەکە تەواوکەری یەکتر بن، نەوەکو وەکو یەك، تا بە هەردووکیان کوتلەیەکی هۆگر و لەگەڵ یەك گونجاو و خۆشەویست و بەبەزەیی لێ پێك بێت، کە(خێزان)ە‌و، بۆیەش خوای پەروەردگار کردوویەتی بە یەکێك لە بەڵگەو ئایەتەکانی﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم: ٢١. واتە:وە لە نیشانەکانی خوایە، کە لە ڕەگەزی خۆتان هاوسەرانێکی بۆ دروست کردون، بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایاندا، خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان، بەڕاستی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێ کە بیر دەکەنەوە .

لەناو ئەم کیانە هۆگر و بەبەزەیی و گونجاو بەبەزەیی و خۆشەویستە، خوای وەدیهێنەر، کارو فەرمانەکانی لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا دابەشکردوە، ئافرەتی تایبەتکردووە بەهەندێ کاری وەکو منداڵ بوون و شیر پێدان و دایەنی کردنی منداڵەکان و، لە خودی ئافرەتدا هۆکاری گونجاوی بۆ ئەم کارانە بەبەردا کردووە، هەر لەشێوازی پێکهاتەی

جەستەیی و هەست و سۆزی و بیرکردنەوەی و، تێڕوانینی بۆ هەموو ئەو کارانەی، کە لە دەورووبەری ڕوودەدەن.

ئەمە مانای ئەوە نییە، کە پیاو و ئافرەت لە هەموو شتێکدا لەیەکتر جیاوازن، بەڵکو ئەندازەیەکی هاوبەش هەیە لە درووستکردنی هەردووکیان، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەو لایەنە تایبەتانەن، کە خوای کاربەجێ، بەبەر هەریەکێك لەدوو ڕەگەزەکەیدا کردوون.

لێرەدا پێویستە سەرنجی خوێنەر بۆ باسێکی تر ڕابکێشین، کە لەبیر و زەینی هەندێ کەسدا تێکەڵ و پێکەڵ بووە، ئەویش بوونی هەندێ ئافرەتە، کە بەباشترین شێوە بەو کارانە هەڵدەستن، کە تایبەتن بە پیاوان، نموونەش بە ئافرەتە ئاسنینەکە تاتشەر دێننەوە، یان هەر ئافرەتێك، کە لە وولاتەکانیاندا بوونەتە سەرۆك، دەڵێن:سەیرکەن! ئەوەتا ئافرەت توانی هەموو ئەو ئەرکانەی تایبەتن بە پیاو ڕاپەڕێنێت و، توانی لەگەڵیدا یەکسان بێت، یاخود لەهەندێ کاتدا بەسەریشیدا سەرکەوێت!

پێشینان گوتوویانە: ڕیزپەڕ یاسا پشتڕاست دەکاتەوەو ڕەتی ناکاتەوە!

خوێندن و فێرکاری بۆماوەی یەك سەدە لە ئەوروپادا-بۆ کوڕو کچانی منداڵ و گەنج-وەکو یەك بوو، ئیتر لەوماوە دوورو درێژەدا چەند (تاتشەر) هاتنە گۆڕەپانەوە!!سەرەڕای ئەوەی، کە بوارەکە بۆ هەردوو ڕەگەزەکە وەکو یەك ڕەخسابوو، تا هەمان فێربوون و زانین وەربگرن و، هەمان ڕاهێنان بکەن و، بۆ هەمان ئامانج ئاراستە بکرێن؟!

تاتشەر تەنها ئافرەت نیە لە مێژوودا، کە توانای ئەو کارەی هەبووبێت، بەڵکو لەپێش ئەودا(حەتشبسوت)و(شجرة الدر) و چەندان ئافرەتی تر

هـەمان كاريـان كـردووە، بـەڵام ئايـا ئـەم حاڵەتـە ڕيزپەڕانـە، ئـەو ياسـا گشتييەی مليۆنەها ئافرەتی بەدرێژايی مێژوو گۆڕی؟!

لـە بەرانبـەردا هەنـدێ پيـاو هـەن، كـە لەگـەڵ ئافرەتـدا هاوبەشـن، لـە خێرايـی ڕاگۆڕانيان، يـان لەلايـەنی زاڵبـوونی هەسـت و سـۆزيان —نـەوەكو عـەقڵ و مـەنتيقيان-لـە بڕيـاردان بەسـەر كاروبارەكانـدا، يـاخود لـە وەرگرتنـی هەڵوێسـت لـە بەرانبـەر ڕووداوەكانـدا.. ئايـا ئـەو حاڵەتـە ڕيزپەڕانـە ئـەو ياسـا گشـتييە ڕەتدەكەنـەوە، كـە دەڵێـت:پيـاوان كـەمتر بەدەنگ هەست و سۆزيانەوە دەچن و، هێواشترن لە هەڵچوونيان و، زيـاتر ويستی هێمنی لە بڕياردان بەسەر كارەكاندا و دوور لـە هەسـت و سـۆز لـە پێكهاتەياندا هەيە؟!

خێرايـی وەڵامدانـەوەو بەدەنگـەوەهاتنی هەسـت و سـۆز بـەدايك بەخشراوە لەلايەن خوای پەروەردگارەوە، تا بەدەم داواكاری منداڵەكەيەوە بچێت، بـە شـێوەيەكی ڕاسـتەوخۆ-بـە هەسـت و سـۆز و بـێ بيركردنـەوە- بـەڵام ئەگـەر پيـاو ئـەو ئەركـەی پـێ بسـپێردرێت، هـەموو جارێـك بـير دەكاتـەوە:ئايـا بەدەميـەوە بچـێت يـان نـا؟! ئايـا كامـەيان ڕاسـتتر و باشترە؟!بەمەش ئازارێكی زۆر بە منداڵەكە دەگات!بەڵام دايك-بە هەست و سۆزی —ڕاستەوخۆ، بەبێ بير كردنەوە بەدەم داواكاريەكەيەوە دەچێت!!

بەهـەمان شـێوە.. ئەگـەر كـار و بـاری دەوڵـەت و، كۆمەڵگـەو، ژيـان و، بەرەوڕوبوونـەوەی تـەنگ و چـەڵەمە قورسـەكان، بكەونـە ژێـر ڕكێفـی گۆڕانی خێرای هەست و سۆزی ئافرەت، ئيتر كار و بارەكان چۆن دەبن؟!

هەموو ئەمانە ئەو بڕە هاوبەشەی نێوان هـەردوو ڕەگەزەكـە بەڕێـژەی هاوشێوەو جيـاواز ڕەت ناكەنـەوە. بـەڵكو هـەردەم كاروبـار بـەپێی زۆرينـە

دەڕوا بەڕێوە، ئەگەر حاڵەتێكی ڕیزپەڕ(شاذ)یش هەبوو، ئەوا خۆی بەسەر هەلوێستەكەدا فەرز دەكات، بەلام یاساكە(القاعدة)، ناگۆڕێت!

****

نەفامییەتی نوێ قسەی چڕو پڕ دەربارەی جیاوازی پشكی پیاو و ئافرەت لە میراتدا كردووە لە شەرعی خوادا.

هەرچەندە پێویست بەوە ناكات، كە ئەو جیاوازییەی لە قسەكانی ئەو نەفامییەتە دەربارەی ئەم باسە هاتووە دەربخەین، لەكاتێكدا كە زۆر لە(دیموكراسی)یەكان، تا ئێستاش مووچەیەكی كەمتر لە پیاوان دەدەن بە ئافرەتان لە بەرانبەر ئەنجامدانی هەمان كاردا، كە چەندین بیانووی جۆراوجۆری بۆ دێننەوە. بەلام پێویستە ئەوە بلێین، كە ئەو جیاوازییەی لە شەرعی خوای كاربەجێدا هەیە، تەنها لە بارەی پارەو سامانی بە میراتگیراوەو، هیچ پەیوەندی بە سامانی وەدەستهاتووەوە نییە، كە لەشەرعی خوای كارزاندا هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا. حیكمەتی جیاوازی پارەوسامانی بە میراتگیراویش، جیاوازی خەرجی و ئەركەكانە. چونكە پیاو-لە شەرعی خوادا-ئەركی خەرجی پێ سپێردراوەو خەرجی خێزان دەكات-كە هاوسەر(ئافرەت)یش تاكێكە لەو خێزانە-بەلام هەرچی ئافرەتە(حاڵەتی وایە)نیوەی میراتی پیاو دەگرێت و، خەرجی هیچ كەسیشی لەسەر پێویست نەكراوە-مەگەر بە ئارەزووی خۆی بێت-هەرچەندە سەروەت و سامانیشی زۆربێت.

دەربارەی جیاوازی شایەتیدانی پیاو و ئافرەتیش، كە لە ئایەتی قەرز(الدَين)ی سورەتی (البقرة) دا هاتووە﴿ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ

وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ﴾ البقرة: ٢٨٢. واتە:ئینجا ئەگەر دوو پیاو نەبوون، ئەوا با پیاوێك و دوو ژن بن، لەوانەی، کە پەسەندیان دەکەن لە شاهێدەکان، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان، لەبیری چوو ئەوی تریان بیری بخاتەوە .

ئایەتەکە خۆی باسی هۆکارەکەی تێدا هاتووە، ئەویش پاراستنی مافەکانە لە ناو خەڵکدا، نەوەکو بارووودۆخێك کار لە ئافرەت بکات و لەبیری بچێتەوە، یاخود لێی تێك بچێت. هەروەکو لە ئایەتەکەدا هاتووە، ئیتر مافی خاوەن مافەکان بفەوتێت.

بەڵام دەربارەی جیاوازی خوێن بایی کوژراوان، خوێن وەرگرتن بەپێی پلەی مرۆڤایەتی مردووەکە نیە، تا بگووترێت مرۆڤایەتی ئافرەت نیوەی مرۆڤایەتی پیاوە لە شەرعی خوادا، پێشتریش ئەوەمان خستەڕوو، کە کتێبی خوا پیاو و ئافرەتی لەڕووی مرۆڤایەتییەوە یەکسان کردوون(بَعضهم من بَعض)(وَخَلَقَ منها زَوجَها).

بەڵکو ئەم خوێن باییە قەرەبووکردنەوەیەکی ماددیە لە بەرانبەر کەسێك، کە بەچەند کار و فەرمانێکی دیاریکراو هەڵدەستا لەماوەی ژیانیدا-یاخود شیاو و لەبار بۆ ئەنجامدانی-.

ئیتر ئەندازەی خوێنباییەکە گونجاوە لەگەڵ ئەو ئەو کارو فەرمانانەی، کە کوژراوەکە دەیتوانی لەماوەی ئەنجامیان بدات، چ پیاو بێت، چ ئافرەت.

****

پوختـەی قسـان ئەوەیـە کـە حیکمـەت لـەو بەرنامـە خواییـەی، کـە ناردوویـەتی ڕۆشـنە و ئاشـکرایە، بـەلاّم ئـەم سەرلێشـێواویەی ئـەمڕۆ لـە نەفامییـەتی نوێـدا هەیـە و، کۆنگرەکـانی ((نەتـەوە یـەکگرتووەکان))و ((پەیمانـەکانیان))و ((بڕیارەکانیـان)) دەری دەخـەن، ئاسـانە مانـا بکـرێن، بەلاّم مانا کردنەوە جیاوازە لە پاکانە بۆ کردن!!

ماناکردنــەوەی بــەوەی کــە(بزوتنــەوەی سەرخســتنی ئــافرەت و دابینکردنی مافەکانی)، لە ڕۆژئاوادا وەکو کاردانەوەیەك بوو بۆ ئـەو زوڵـم و سـتەمەی، کـە پیـاوی ڕۆژئـاوایی لـە سـەردەمی نەفامییـەتی یەکەمیـدا دەیکرد! هەموو کاردانەوەیەکیش لە مێژوودا، لەوانەیە زوڵم و سـتەمێکی چارەســەرکردبێت، بــەلاّم لەبەرانبەریشــدا لایــەنێکی تــری تێکــداوە.. سرووشتی کاردانەوە وایە، کە نە عەقڵی، نە مـەنتیقی نابێت، هەرچـەندە ئیددیعای ئەوەش بکات! بەڵکو تەکانێکە، کە هەرگیز لە خاڵی هاوسـەنگدا ناوەستێت، بەڵکو تێدەپەڕێنێ بەهۆشـیاریەوە بێـت، یـان بـەبێ هۆشـیاری- وەکو تۆڵـە سـەندنەوە لـەو بارودۆخـە خراپـەی، کـە پێشـتر هـەبووە، ئـیتر هەڵە بەهەڵە و، خراپە بە خراپە دەگۆڕێ!

بەلاّم شەرعی خوای کاربەجێ کاردانەوە نیە بۆ هیچ ڕووداوێك، کـە لـە جیهانی مرۆڤدا ڕوودەدەن، بەڵکو لـەلای خـوای جیهانیـان هاتۆتـە خـوارێ، بـۆ بـەرپاکردنی ژیـانی مـرۆڤ، لەسـەر ئـەو یاسـایەی، کـە خـوای مـرۆڤ دەزانێت، کە هەر ئەویاسایە بۆ ئەو درووستکراوەی گونجاوەو دەشـێ، ئـەو خوایەی، کە خۆی مرۆڤی دروست کردوەو، بەر لـە درووسـتکردنی هـەموو شـتێکی لـەبارەوە دەزانــێ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾ الملـك: ١٤.

واتە: ئایا ئەو خوایەی، کە مەردومی دروست کردووە ئاگای لە نهێنییان نییە، لە کاتێکدا ئەو ووردبین و ئاگادارە؟!. ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ الحديد: ٢٥ ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد: ٢٥. واتە: ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونەوە، کتێبی ئاسمانی تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن، بۆ ئەوەی خەڵکی لەناوخۆیاندا بە دادگەری ڕەفتاربکەن .

لەڕاستیدا هەندێ خەڵك لە جیهانی ئیسلامیدا، پەیڕەوی ئەو شەریعەتە ناکەن، کە خوای کاربەجێ ناردوویەتیە خوارێ و، زوڵم و ستەمی وا لە ئافرەت دەکەن، کە هاوشێوەی نەفامییەتی عەرەبە پێش هاتنی ئسلام، ئیتر دەبێ کێ لۆمەی بکرێ؟ چارەسەریش چیە؟

ئیسلام هەروەکو چەند جاران گووتومانە بەڵگەو بیانوو(حجّة)یە بەسەر ئوممەتداو، هیچ کاتێك ئوممەت بەڵگەو بیانوو نیە بەسەر ئیسلامدا، ئەگەر ئوممەت لەسەر ئەمری خوا جێگیر بوو، ئەوا لەسەر ڕێگای ڕاستەو، ئەگەر لێشی لادا، ئیتر گومڕاو سەرلێشێواوەو ئایینی خوا، هەروەکو خۆی دەمێنێتەوەو، گومڕایی ئوممەت کاری تێناکات.

چارەسەریش، تەنها ئەوەیە کە خەڵك بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام بەوشێوەیەی کە خوا ناردوویەتی هەروەها ئەرکی بانگەوازخوازانە، کە

بەڕوونکردنەوەو پەروەردەکردنی بەردەوام و بێ پچڕان، خەڵکی بۆ لای شەرعی خوا بانگ بکەن، بۆ ئەوەی ژیانیان لەسەر زەوی ڕێك و پێك بێت..

بەڵام ئەو خراپەو سەرلێشێواویەی، کە ڕۆژئاوا تێی کەوتووە و، هەندێ کەسی هەڵگری ناسنامەی ئیسلامی بانگەوازی بۆدەکەن بە قسەی شەیتانانی زەوی بێت یان نا-پیاو و ئافرەتی خەڵەتاندووەو، هەموو بەند و بارێکی لەبەردەم لاداون، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لەلای خۆی بەدەستبێنێ و، بۆ کاری خراپ و حەڕام سوودی لێوەربگرێ، ئەمیش بخاتە ناو حەڕامەوە!!

ئایینی خوا بۆ ئەوە نەهاتووە تا مرۆڤ لەسەر لاڕێی بڕوێنێ، یان لەسەری بەردەوام بێت، بەڵکو بۆ چاکردنەوەو، نەهێشتنی ئەو لاڕێی و ئینحیڕافە هاتووەو، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانە هاتووە، کە تووشی چەندین نەخۆشی هاتوون!!

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ یونس: ٥٧. واتە :ئەی خەڵکینە بێگومان ئامۆژگاری(قورئان)لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە، شیفاو چارەیە بۆ ئەوەی لەناو دڵ و دەروونتاندایە، ڕێنموونی و میهرەبانییشە بۆ بڕواداران﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ الإسراء: ٨٢. واتە: لەم قورئانەدا ئەوە دەنێرینە خوارەوە، کە هۆی شیفاو میهرەبانییە بۆ بڕواداران، بەڵام هاتنی ئەم قورئانە بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات، جگە لە خەسارەتمەندی.

با بەخێرایی سەرنجێکی کۆمەڵگەی ئیسلام بدەین، لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، کە بە ئیسلام دەژیا و بۆ ئیسلام دەژیا، بۆیە دەڵێین کە کۆمەڵگەیەکی ڕاست و درووستە، ئەو کۆمەڵگەیەی، کە لە ئاسۆی بەرز دەژیێ، گرفت و کێشەکان زۆر کەم دەبێتەوە، چونکە خەڵك ئەگەر لە ناڕەحەتیشدا بژین بێئاگان لە خودی خۆیان، بەهۆی سەرقاڵییان بەو پلەو پایە بەرزانەی، کە باوەڕیان پێ هەن و هەوڵی وەدیهێنانیان دەدەن و لە پێناویاندا دەژین. پاشان ئەگەر لەو ئاسۆ بەرزە دابەزین و، لەوبەهایانەی بەهۆیەوە دەژیان و لە پێناوی بەهاکان دەژیان، سەرقاڵ کران، ئیتر کێشەکان زۆر دەبن و پێویستی بە چارەسەرکردن دەکات، بەمەش گیر و گرفت لە ناو خەڵکدا سەرهەڵدەدەن!

لەو کۆمەڵگەیەدا پیاو و ئافرەت تەواوکەری یەکتر بوون، بەو شێوە دەژیان، کە خوا پیاو و ئافرەتی دروست کردوە، کە دڵنیایی و ئارامی و خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانیان.

ناڵێین هەرگیز هیچ کێشەیەك ڕووی نەداوە!چونکە ئەمە لە ژیانی دونیادا بۆ خەڵك وەدی نایەت، دونیایەك، کە خوا کردوویەتی بە ماڵی تاقیکردنەوەو زەحمەت و ناڕەحەتی.

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾

الإنسان: ٢. واتە:بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان درووست کرد، لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە گلی توخم، تا تاقی بکەینەوە، ئینجا گێڕامان بە بیسەری بینەر﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴾ الانشقاق: ٦. واتە:ئەی ئادەمی! بەڕاستی تۆ هەردەم لە کۆشش کردن دایت بە کۆشش

کردنێکی جددی بۆلای پەروەردگارت، جا پێی دەگەیت لە تێکۆشان دایت ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴾ البلد: ٤. واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئادەمیزادمان درووست کردووە لە ڕەنج و کێشەو ناڕەحەتیدایە.

لە کۆمەڵگەی پێغەمبەری خوادا بوو(ﷺ)، ئەو ژنەی سکاڵای مێردەکەی بردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴾ المجادلة: ١. واتە:بەڕاستی خوا ووتەی ئەو ژنەی بیست، کە لەبارەی مێردەکەیەوە، گفتوو گۆی لەگەڵ دەکردی، سکاڵای خۆی بۆلای خوا دەبرد، خوا گوێی لە ووتووێژی هەردووکتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەری بینایە.

بەڵام ئەم خاسیەتە بەسەر ئەو کۆمەڵگەیەدا زاڵ نەبوو، کە لە بەرزترین و پایەدارترین سەردەمی مرۆڤایەتیدا ژیاوە.

بەڵکو کۆمەڵگەی موسوڵمان-سەرەڕای ئەوهەموو لادانەی کەتووشی بوو-ماوەیەکی زۆر لە هەموو کۆمەڵگاکانی تر کەم تاوان تر بوو و، لەهەموان کەمتر مەیخواردنەوەی تێدا بڵاو بوو و، لەهەموویان کەمتر خراپەکاری تێدا بوو، تا ئەوکاتەی ڕۆژئاوا هێرشی بۆ هێنا و، میکرۆبەکانی تێدا بڵاو کردەوە، بێ ئەوەی چارەسەری بکات!!

چارەسەریش لە قورئان و، سوننەتی بەپێزی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دایە.

چارەسەر هەر لەوئیسلامە دایە، کە خوا ناردویەتیە خوارێ.

****

# تاوان و سزا
# له مەنهەج و ڕێبازی خواییدا

ئیسلام له ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە نامۆیی و غوربەتی دووەمی دایە، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەیەوە فەرموویەتی:بدأ الاسلام غریبا، وسیعود غریبا کما بدأ، فطوبی للغرباء. رواه مسلم. واتە:ئیسلام بە غەریبی سەری هەڵدا و، هەروا دووبارە غەریب دەبێتەوە، خۆشی و سەرفرازی بۆ ئەو نامۆ و غەریبانەی، کە دەست بەو دینەوە دەگرن.

له غوربەتدا زۆر سیما، خاسیەتی گەورەی ئەم ئایینە گەورەیە لە بیری خەڵکدا نامێنن و، هەرا و هۆریای دوژمنان بەرز دەبێتەوەو، لێڵی دەربارەی ڕاستی و درووستی ئەم دینە بڵاو دەبنەوەو، دڵی بێئاگایان بەخێرایی وەری دەگرێ، گومانی ئەوەیان لا درووست دەبێت، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم دینە لەسەر زەویدا فەرمانڕەوایی ناکات، لەبەرانبەریشدا دڵی چەندان کەسانی تر سەرسام دەبن و پرسیار دەکەن:ئایا ئەوە ڕاستە، کە ئەمانە دەیڵێن؟ئەگەر ئەمە ڕاست نیە ئەدی ڕاستییەکە چیە؟

یەکێ لەو گووتانەی کە بەسەر زاری ئەو کەسە بێئاگایانەدا دێت، ئەوانەی کەهەر هات و هاوارێك لە هەر شوێنێك بێت، بۆ دژی دین ئاراستەی دەکەن، دەڵێن :ئەو سزایانەی ئەم ئایینە دایناون، سزای دڕندەیین، گەر بۆ خێڵەکیەکانی بیابان لەو سەردەمە دوورەدا قەبووڵ دەکرا و، کاری پێدەکرا ئیتر مرۆڤایەتی شارستانی بووەو قەبووڵی ناکات،

بۆیە بابەدوای سەرچاوەیەکی تردا بگەڕێین، کە یاساکانی لێوەربگرین، تا بتــوانین لەگــەڵ ئــەو پێشــکەوتنە بــڕۆین، کــە وڵاتــە پێشــکەوتووەکان پێیگەیشتوون و، دەبێ بڕوامـان بـە (مێـژوو)ییـەتی ئیسلام هـەبێت، واتـە بۆسەردەمی خۆی شیاو بوو و، ئیتر کەڵکی نەماوە!!

****

ئــەو جــۆرە کەســانە لەڕاســتییەکی گــەورەی ئــەم دینــە بێئاگــان:کــە مەبەستی یەکەمی ئەم ئایینــە دانـانی سـزا نییـە بـۆ تاوانبـار(دواتـر باسـی تونـدی ئـەم سـزایانە دەکـەین)، بـەڵکو مەبەسـتی یەکـەمی، نەهێشـتن و لەناوبردنی ئەو هۆکارانەن، کە خەڵکی هان دەدەن بۆ ئەنجامـدانی گونـاه و تاوان، بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی بێ تاوان پەیدا بێت-بە ئەنـدازەی توانـای مـرۆڤ-دواتـر ئەگـەر کەسـێك هـەبوو هـەوڵی ئەنجامـدانی تـاوانی دەدا، با سزایەکی توند چاوەڕوانی بکات، کە دامرکێنـەری هەسـتی تاوانکاری بێـت و، چـەند جـار بـەر لـە ئەنجامـدانی تاوانەکـەی، بـیر لـە توونـدی سـزاکەی بکاتەوە!

ئا ئەمەیە بەرنامەی تێر و تەواو، لەیەك کاتدا هەموو لایەنەکان لەخۆ دەگرێت، تەنها تەماشای یەك ڕوو ناکات و، لایەنەکانی تر فەرامۆش بکات، هەروەکو لـەو ڕێچکە مرۆڤیانــەدا ڕوودەدەن، کــە دوورن لــەڕێبازی خــوایی ﴿ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ الأعراف: ٣٠. واتــە: واش دەزانـن، کە ڕێگەی ڕاست و درووستیان گرتۆتەبەر.

****

سـەرنجی کۆمەڵگـە پێشـکەوتووەکان بـدەو، سـەیری ڕێـژەی تـاوان بکـە تیایاندا.

ئامارەکانی ئەو کۆمەڵگایانە دەری دەخـەن- کە لـە ڕاسـتیدا ئـەو چاکە ڕاسـتەقینەی، کـە ئـەوان هەیانــەو ئێمــە تــا ئێسـتا لــە فــەوزای ژیــانی ئێسـتاماندا نیمانــە، ئــەو ئامــارە وورد و ڕاســتانەن، کــە دەربــارەی ڕووداوەکـانی کۆمەڵگـە هەیانـە-ئامارەکانیـان دەڵێن لەهـەر چـرکەیەکدا حاڵەتێکی دزی، یاخود ڕووداوی هەڵکوتانەسەر شوێنان بە مەبەسـتی دزی و جەردەیی، یان ڕووداوی کوشتن، یان ئەو ڕووداوانـەی، کـە لەگـەڵ کەسـە بێهۆشەکاندا ڕوودەدەن، یان ڕووداوی دەستدرێژی کردنـە سـەر ئافرەتـان و چـەندان ڕووداوی دی ڕوودەدەن، ئەمــە سـەرەڕای ئـەو گرووپانــەی، کـە داهێنان و هونەر دەکەن لە تاوانکاریدا و، نوێترین ئـەو ڕێگـاو هۆکارانـەی، کە زانست پێی گەیشتووە، لەو تاوانانەدا بەکاری دێنن.

کۆمــەڵگای ڕۆژئــاوا لــەتاوان و سـزادا بــە چـەندین قۆنـاغی جیـاوازدا تێپەڕیوە. ڕۆژێ لەڕۆژان —پێش شۆڕشی فەڕەنسا -هەژاریی کارەسـات بـوو بــۆ فــەقیر و هــەژاران، بۆیــە هــەردەم گومــانی تاوانکـاری دەخرایەســەر هـەژاران و نـەداران، بـەهۆی هەژاریانـەوە، ئـیتر هـەردەم ئـەو بـە تاوانبـار دادەنرا، تا بێ تاوانی نەسەلمێنرابا و، کاری سەلماندنی بێ تاوانیشی کارێکی ئەسـتەم بـوو، چـونکە هــەژار بــووالــە بەرانبەریشـدا پیـاوانی ڕژێمـی دەرەبەگایــەتی و پیــاوانی ئــایین، لــەژێر ســایەی ئــەو یاســایەی، کــە سەرکردەکانیان بۆیان ڕەخساندبوون، خوێنی هەژارانیان دەمژی!

لــەدوای شۆڕشــی فەڕەنسـا، باروودۆخەکـە گـۆڕاو، ووردە وووردە مـافی تاکەکەس دابین کرا، بەڵام هەردەم لـەو بەرنامـە مرۆڤییانـەی، کـە دوورن

لە ڕێبازی خوا، دەرگا بۆ زوڵم و ستەم هەردەمێنێتەوە، تا فەرمان بەدەستەکان بە پاساکانیان زوڵم و ستەم لە ژێر فەرمانەکانیان بکەن و، بەتواناکەیان تاوانی گەورە ئەنجام بدەن و لەسەریشیان سزا نەدرێن، لە کاتێکدا هەزاران لەسەر تاوانی زۆر بچووکتر سزا بدرێن!!

پاشان لەسەردەستی فرۆید، دەروونزانی شیکاری هاتەکایەوە، کە لەڕاستیدا زانستی پاساو هێنانەوەبوو بۆ تاوانکاران، ئیتر تێڕوانینەکان بەرانبەر تاوانکاران ووردە ووردە گۆڕا، تاوای لێهات هەندێ جار وەکو کەسێکی تاوانلێکراو لە تاوانکاران دەڕوانرا!هەروەها سزاکانیش هەنگاو بە هەنگاو سووکتر دەبوون، تا وای لێهات هانی تاوانکاریان دەدا!ئیتر ئەو کۆمەڵگایانە وەکو کارگەی بەرهەمهێنانی تاوانیان لێهات!

لەبەر سێبەری ئەم ڕاستییە، هێشتا هەندێ کەس وا لە سزاکانی ئیسلام دەڕوانن، کە بۆ ئەو بارووذۆخەی لە ڕۆژئاوادا ڕوودەدات شتێکی ناشیرین و نابەجێ و دڕندانەیە، کە ناکرێ لە جیهانی شارستانیدا پەیڕەو بکرێن!!

****

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە ئیسلام هەوڵ دەدات بەئەندازەی توانای مرۆڤ لەسەرزەویدا، کۆمەڵگە لە تاوان بپارێزێ، دیاریشە، کە ڕووی زەوی هەرگیز لە تاوان پاك نابێتەوە. لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریشدا(ﷺ)، کە بەرز و بەڕێزترین کۆمەڵگەیە، کە مێژوو بەخۆیەوە دیبێ، بە شایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران:١١٠ واتە: بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن

کە بۆ سوودی خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە. هەروەها پێغەمبەریش(ﷺ)، فەرموویەتی: خير القرون قرنی. رواه الشيخان. واتە: باشترین سەردەم سەردەمی منە.. لەم کۆمەڵگەیەدا کەسی وا هەبوو، کە دزی دەکرد و، هی واهەبوو زینای دەکرد، هی وا هەبوو مەی دەخواردەوە. بەڵام جیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵگەیەك، کە بەدەگمەن نەبێ تاوانی تێدا ڕوونەدات، لەگەڵ کۆمەڵگەیەك، کە لە چرکەیەکدا چەندین تاوانی جۆراوجۆری تێدا ڕوودەدەن!

ڕێگاکانی ئیسلام بۆ پاراستنی کۆمەڵگە لە تاوان بەو ئەندازەیەی، کە لە توانای مرۆڤدا هەیە دوو بەشن، کە لەگەڵ یەکتر هاوکارن و پشتگیری یەکتر دەکەن. یەکەمیان، چاندنی تۆوی باوەڕبوونە بە خوا و ڕۆژی دوایی لە دەروونەکاندا و، قووڵ کردنەوەی ئەو باوەڕە، بە پەروەردەکردن لەلایەك، وەبیرهێنانەوەی بەردەوام لەلایەکی ترەوە ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الذاريات: ٥٥. واتە:هەمیشە ئامۆژگارییان بکە، چونکە بەڕاستی ئامۆژگاری سوود بە ئیمانداران دەگەیەنێت. ڕێگای دووەمیش، دۆزینەوەی ئەو ڕێگا کردەییانەی، کە تاوانکارانیان پێ لە بیری تاوانکاری لابدەن.

ئەگەر پاڵنەری سەرەکی دزی، برسێتی بێت، هی زینا غەریزەی جینسی بێت، هی مەیخواردنەوە هەوڵدان بێت بۆ هەڵاتن لە ڕاستی و باروودۆخێکی خراپ، کە مرۆڤ تیایدا دەژی بەرەو جیهانی خەیاڵ، کە کێشەی تێدا نین، ئەگەر پاڵنەری تاوانەکانی کوشتن تۆڵەسەندنەوە بێت لە کەسێکی دیاریکراو، یان کۆمەڵگە بە گشتی.. ئەگەر هەموو ئەمانە

پاڵنەربن بۆ تاوان، ئەوا ئیسلام لەسەرەتادا هەوڵ دەدات، کە کۆمەڵگەیەك بەرهەم بێنێت، کە ڕێگری بکات لە درووست بوونی ئەم پاڵنەرانە، یاخود هەوڵ دەدات بۆ کەمترین ئەندازە کەمیان بکاتەوە، ئەگەر هەر نەتوانرێ بەتەواوی بنبڕ بکرێن.

سەرەتا بۆ برسێتی-واتە هەژاری بەگشتی-ئیسلام فەرزی زەکاتی داناوە، ماڵ بەخشینی خێرخوازیشی داناوە، کە ئیسلام پشتگیری دەکات و هانی دەدات و، هاوکاری واجب و هاوکاری خێرخوازی داناوە، نەهێشتنی برسێتیشی لەسەر دەوڵەت پێویست کردوە.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد، کە چۆن کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، گەیشتە ئەو پلە بەرز و نموونەییە، کە زۆر لە مێژوو نووسان بە خەلیفەی پێنجەمی ناوزەد دەکەن.

بەلام با لێرەدا لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا(ڕەزای خوای لەسەربێت) هەڵوەستەیەك بکەین، کە نموونەی هەرە بەرزی ئەو باسەیە، کە ئێمە لەبارەیەوە دەدوێین.

عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لەسەربێت)، عادەتی وا بوو، کە شەوانە دەگەڕا، تا لە حاڵی خەڵك ئاگاداربێ، بەلای(ڕەشماڵ)ێکدا تێپەڕی، گوێی لە گریانی منداڵان بوو و، دیتی کە ئافرەتێك مەنجەڵێکی لەسەر ئاگردا دانابوو، ئەویش لێی پرسی:ئەم منداڵانە بۆچی دەگرین؟گووتی:لەبەر برسێتی. گووتی ئەدی ئەوەی لەسەر ئاگرە چیە؟گووتی:چەند ووردە بەردێکە، منداڵەکانی پێ دەخافڵێنم تا دەخەون. هەروەها ئەوەشی لە قسەکانی زیادکرد(عومەریش ئاگای لێمان نیە)!ئەویش گووتی:عومەر لەکوێ بزانێ؟گووتی:ئەدی بۆچی کاری

مسـولْمانانی گرتۆتـه دەسـت؟!پاشـان عومـەر گریـا، تـا ڕیشـی تـەڕبوو و، بەپەلە چووە (بیت المال) و، هەندێ ئارد و ڕۆنـی بۆهێنـا، بەرپرسـی(بیـت المـال) پێـی گـووت:بـا لـەجیاتت هـەڵی بگـرم. عومـەریش گـووتی:ئـەدی لـە ڕۆژی قیامەتـدا کـێ لـەجیاتم هەڵـدەگرێ؟!پاشـان خۆراکەکـەی خستـە نـاو مەنجەڵەکـە و، فـووی لـە ئاگرەکـە کـرد، تـا خواردنەکـە ئامـادەبوو و، منداڵەکانی نان دان و، لەوێ نەجوولاّ، تا خەوتن.

هـەروەها عومـەر(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)، لەسـاڵی برسـیەتی(عـام الرمـادە)، سـزای دزی ڕاگـرت، نـەك بەمەبەسـتی هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو حوکمەی، کە خوا ناردوویەتیـە خـوارێ، وەکو هەنـدێ نوسـەر بـەم جۆرە باسی دەکەن، تا بەهۆیەوە پشتگیری ئەو کەسانەی پێبکەن، کـە حـوکم بـە شەرعی خـوا ناکـەن، بـەڵکو بەمەبەسـتی بـەکارهێنانی شـەریعەت بـوو بـە مانـا فراوانەکـەی، چـونکە پێغەمبـەر(ﷺ)، فەرموویـەتی:ادرؤا الحـدود بالشـبهات. واتـە: سـنور و حـدودەکان بـەهۆی ئـەو شـتانەی هـۆی گومـانن لابدەن.

هـەروەها لـە هـەمان سـاڵدا، برسـێتی هۆکارێـك بـوو بـۆ لادانـی سـزا، هەرلەبەر ئەوەش بوو، سزا بەسەر ئەو دزەدا نەسەپێنرا، کە دزی بـۆ تێـر بوونی خۆی و خاو و خێزانەکەی کردبوو.

دوو کـوڕی خزمـەتکاری حاتـەبی کـوڕی بەلتەعـە، ووشـترێکی پیـاوێکی (مـوزنی)یـان دزی بـوو، پیـاوە موزنییەکـە هـەردووکیانی گـرت و هێنـانی بۆلای عومـەری کـوڕی خـەتتاب(ڕەزای خـوای لەسـەربێت)تـا حـەددیان لـێ دەربکات، ئەمیش ڕووی لە حاتـەب کـرد و، گـووتی:ئەگـەر نەمـدەزانی کـە چەنـد ماندوویان دەکەن و، برسیان دەکەن، تـا ئاسـتێك ئەگـەر حـەڕامیش

بخۆن بۆیان حەلاڵ بێت، ئەوا دەستم دەبڕین. بەلاّم ئەگەر دەستیشیان نەبڕم، سزاییێکت دەدەم، کە ئازارت بدات!پاشان ڕووی لە پیاوە موزنییەکە کردوو، لێی پرسی:ووشترەکەت بە چەند لەسەرە؟گووتی:چوارسەد. پاشان عومەر(ڕەزای خوای لەسەربێت)، بە حاتەبی گووت:بڕۆ هەشت سەدی بدەری!!

چ عەدالەت و دادگەرییەك لەم دادگەرییە جوانتر هەیە؟!چ بیر و هۆشێك لەم بیر و هۆشە تیژتر هەیە؟!چ ئاسۆیەك لەم ئاسۆیە فراوانتر هەیە؟!

****

سەبارەت بە تاوانی (زینا)ش، ڕێبازی خوایی دەرگای بەرانبەر ئەویش داخستووە-دوای قووڵ کردنەوەی ئیمان بە خواو ڕۆژی دوایی و، پەروەردەکردنی ترس و پارێزکاری لە دڵدا و، ترسان لە تووڕەبوونی خوا- بە ئەنجامدانی کردەیی، کە هیچ بیانوویەك بۆ زیناکەر ناهێڵێتەوە کە زینا بکات، بەوەی، کە هانی هاوسەرگیری زوو دەدات و، دەربارەی لە قورئاندا دەفەرمووێت:﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ النور: ٣٢ - ٣٣.

واتە: ژن بدەن بەپیاوانی بێ ژن، ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صالحەکانتان و کەنیزەکانیشتان بدەن بە شوو، ئەگەر هەژاریش بن، ئەوا خوا لەفەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خوای گەورەش همیشە فروانگیرو زانایە . دەبا ئەوانەی هاوسەریان

دەست ناکەوێت هەوڵ بدەن داوێنی خۆیان پاك ڕابگرن، هەتا خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)، فەرموویەتی:یا معشر الشباب، من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، ومن لم یستطع، فعلیه بالصوم، فانه له وجاء. رواه البخاري. واتە. ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر توانای (جەستەیی و ماددی و مەعنەوی )هەبوو، با هاوسەرگیری بکات، هەرکەسێکیش توانای نیە، با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە.

ڕێبازی خوایی بەتەنها بەو کردارە ناوەستێ، کە دەرگا بۆ پاڵنەری غەریزە بەشێوەیەکی پاك و پیرۆز و بەرهەمدار دەکاتەوە و، دەرگاکەی تر-دەرگای شەیتان-دادەخات، لەهەمان کاتدا، کار بۆ ڕێگرتن لە پاڵنەرە جینسییەکان دەکات، کە هۆکارن بۆ وورووژاندنی غەریزەی جینسی لە مرۆڤدا، کە قەدەغەی تێکەڵی نێر و مێ و، دەرخستنی جوانی و ڕازاوەیی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە دەکات و، قەدەغەی چوونە ناو ماڵی خەڵکی بەبێ مۆڵەت دەکات و، منداڵان ناچار دەکات، کە کاتێك گەیشتنە تەمەنی هەرزەیی، بەبێ مۆڵەت نەچنە ژووری دایك و باوکیان﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ النور: ٢٧. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! مەچنە هیچ ماڵێك، جگە لە ماڵەکانی خۆتان، هەتا کارێك نەکەن کە ئەوان ئاگادار بن ( وەکو زەنگ لێدان، یا لە دەرگادان ) پاشان کە مۆڵەتدران سەلام لە خەڵکی ماڵەکە بکەن، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو

شێوەیە رەفتار بکەن، هەوڵ بدەن لە یادتان بێت و ئەو شێوازە فەرامۆش نەکەن ( کاتی لەبارو گونجاو هەڵبژێرن بۆ سەردانەکانتان، بۆ ئەوەی میوان و خاوەن ماڵ دڵیان بەیەك بکرێتەوە) . ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور: ٣٠ - ٣١. واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەپیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لەسەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم ) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و روالەت و رۆح لاشەیان)بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و رەفتارانەی، کە دەیکەن. بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم ) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە ( وەك دەم و چاو و دەست ) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و

زینـەتی خۆیـان دەرنەخـەن بـە تـەواوی بـۆ هاوسـەرەکانیان نـەبێت، یـان باوکی خۆیـان، یـان بـاوکی مێردەکانیـان، یـان کـوڕی خۆیـان، یـان کـوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك پەیوەندیان هەیە پێکەوە، یان ئەوانـەش کـە کـەنیزەکانیان (کەلـە بـارودۆخی تایبەتـدا هـەبوون ) یـان ئەوانـەی، کـە لـە ماڵەکانتانـدا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نیە (لەبەر پیری، یان نەخۆشـی ... هتـد ) یاخود ئەو منداڵانەی، کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەت نیـە و ( ئـارەزووی جنسیان بـۆ دروسـت نـەبووە و و نـازانن باسـی عـەورەت بکـەن ) نابێـت ئافرەتانی ئیمانـدار پێیان بدەن بە زەویدا ( تا دەنگـی خشـڵ پاوەنـەکانیان بێـت ) و بزانرێـت، کـە زینەتـدارو خشـڵدارن، کەواتـە هـەمووتان ئـەی ئیمانداران بەرەو لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرفراز بن .

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَـٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَـٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلۡحُلُمَ فَلۡيَسۡتَـٔۡذِنُواْ كَمَا ٱسۡتَـٔۡذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَـٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ النـور: ٥٨ - ٥٩. واتـە: ئـەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە بــا بەنــدەو ئــەو منداڵانــەتان (کــە هێشــتا نەگەیشتونەتە تەمەنی هەرزەکاری) لە سێ کاتـدا ( فێـری ئـەوە بکـرێن )

مۆڵەت بخوازن ( لە کاتی نووستنی ژن و مێردا ) پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ، کە پۆشاکتان دادەنێن ( بۆ حەوانەوە )، لەدوای نوێژی خەوتنان، سێ کاتە، کە لە وانەیە عەورەتی ئێوەی تێدا دەربکەوێت ( با کەسی تر نەتانبینێت )، لە دوای ئەو سێ کاتە قەیناکات بۆ ئێوەش ئەوانیش، کە بگەڕێن بەناو یەکدا بچن بۆ لای یەکتر، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ( تا تووشی کێشەی دەروونی نەبن ) خواش هەمیشە زانا و دانایە ( بەوەی کە دەبێتە مایەی خێرو خۆشیتان ). هەر کاتێك منداڵەکانتان باڵغ بوون، با ئەوانیش مۆڵەت بخوازن، وەکو چۆن کەسانی پێش ئەمان مۆڵەتیان خواستووە ( لە کاتی هاتووچۆ کردنی ژووری دایك و باوکدا ) ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، خوا زانا و دانایە (بە بەرژەوەندیەکانتان ). بەهەموو ئەو هۆکارانەی کە باسکران، پاڵنەری جینسی ڕێك دەخرێت و، بەوکۆت و مەرجانەوە دەبەسترێتەوە، کە ڕێگری لێدەکات، کە ببێتە ئارەزوو و، تەوژمێك، کە هەرگیز تێر نەبێت، هەروەکو نەفامییەتە کۆن و نوێکان دەیکەن، بەتایبەتی نەفامی نوێ، کە دەرگای بۆ چوونە ناو ئەم کارە والآ کردووە، تا لایەنگرانی شەیتان تێیدا بچنەژوورەوە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النور: ١٩. واتە: بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لەناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بڵاوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان

ئامادەیە، خواش خۆی چاك دەزانێت، ( سەرەنجامی زیناو شەڕواڵپیسی بەرەو کوێ دەچێت ) ئێوە نایزانن ..

****

پاڵنەری سەرەکی مەیخواردنەوەو مادده بێهۆشکەرەکان، هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، هەوڵدانە بۆ هەلاتن لە واقیعی خراپی مرۆڤ، بەرەو جیهانێکی خەیاڵی دوور لە تاڵی و ناخۆشیەکانی ژیان.

لە دونیادا-ماڵی تاقیکردنەوە-ژیان بەبێ تاڵی و ناخۆشی نابێت، بەلام لە بەرانبەریدا هەڵوێستەکانی مرۆڤ جیاوازن!مرۆڤی خاوەن هیممەت و ویستی بەهێز، هەرگیز کۆسپ و تەگەرە، چۆکی پێدانانێت و نابنە ڕێگر لەبەردەم هەوڵدانی بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی کە بۆخۆی داناون و سەرنەکەوتنی لە هەوڵێکدا، لە هەوڵدان ساردی ناکاتەوە. بەلام کەسی بێ ویست و هیممەت، هەلاتن لە کێشەکانی بۆ ئاسانترە لە ئازارەکانی و هەوڵدان بۆ زاڵ بون بەسەریاندا.

لەلایەکی ترەوە، مرۆڤی بەندەی هەواو ئارەزووەکان هەن، ئەوانەی، کە وابیر دەکەنەوە، کە مەی(عەرەق) و، ماددەی هۆشبەر، یارمەتیدەرن بۆ زیاد کردنی تام و چێژ وەرگرتن لە کارە خراپەکانی تر، کە ئەنجامیان دەدەن.

ئیسلام ئەو جۆرە کەسانەی خۆشناوێت، چونکە خاوەنی کەسایەتییەکی جێگیر و هاوسەنگ نین و، بە کەڵکی کاری گەورە نایەن، چونکە ئەو ووزەیەی خوا پێی بەخشیون لە شتێکی وا خەرجی ناکەن، کە بۆ خۆیان و کۆمەڵگاکەیان کەڵکی هەبێت. سەرەڕای ئەو ئالوودەبوونەی کە لێی دەکەوێتەوە و، فێری ماڵ خەرج کردن و خواردنەوە لە شوێنی

نەشیاو و، ئەنجامدانی تاوان دەبێت. مەی(عەرەق)یش، دایکی هەموو تاوانە گەورەکانە، هەر وەکو پێغەمبەر(ﷺ) وای فەرمووە.

ئیسلام ڕێبازێکی تێر و تەواوە بۆ هەموو ئەم شتانە. چونکە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ خوا و، قووڵ کردنەوەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و، چاندنی ترسی خوا لە دڵدا، ئەو هۆکارە پەروەردەییە گەورەیە، کە ئیسلام بۆ پاککردنەوەی دڵی مرۆڤ لە پاڵنەرەکانی تاوان بەکاری دێنێ.

لەتەك ئەمەدا، ئیسلام هەوڵ بۆ بەهێزکردنی ویست و ئیرادەی ئیمانداران بەدوای جیهاد دا دەدات:﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾ الحج: ٧٨. واتە: هەروەها بەردەوام بن لە خەبات و جیهاد و کۆشش لە پێناوی خودا بەو شێوەی، کە شایستەیەتی، لەبەر خاتری ئەو بێت، ئەو زاتە بۆ ئەوە هەڵی بژاردوون، لە ئاین و بەرنامەیکدا هیچ جۆرە شتێکی ناڕەواو قورس و گرانی لەسەر دانەناون ( کەنەتوانن ئەنجامی بدەن، جا ئەم بەرنامەیە ) ڕێ و شوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باوکتانە، کە پێشتر هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بە موسڵمان ناوی بردوون، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت ( کە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون ) و ئێوەش ( بەگەیاندنی ئەو پەیامە ) ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، کەواتە نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش (لە ماڵ

و سامان و زانست و هێزتان ) دەربكەن و پشت بەخوا ببەستن، چونكە هەر ئەو زاتە یار و یاوەرتانە، جا دڵنیا بن، كە خوا چەندە یارمەتیدەرێكی چاكە و چەندە پشت و پەنایەكی بەهێزو بە نرخە .

جیهادیش، لوتكەی هەوڵ و كۆششە، چونكە مرۆڤ كە گەیشتە ئەم پلەیە، هیممەتی دانابەزێت لەكاتی هاتنەپێشی كۆسپ و تەگەرەكان، سەرەڕای ئەو بەها بەرزانەی، كە مرۆڤ بەرز دەكەنەوەو، لە شتە بێ بەهاكان دووری دەخەنەوەو بەرزی دەكەنەوە بۆ ئەو ئاسۆ بەرزانە، تا وزەكانی بەجۆرێك بخاتە كار، كە لە مرۆڤی چاك بوەشێتەوە: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴾ آل عمران: ١٤ - ١٧.

واتە: ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە وخاوەنێتی ئاڵتون وزێڕ زیووی زۆرو زەبەندە و ئەسپی چاك ورەسەن و(هۆكانی هاتو چۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری كشتوكاڵ بۆ خەڵكی رازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دونیان، خوایش (بۆچاكان)شوێنی گەڕانەوەی رازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادە كردووە (كە بەهەشتە) . (ئەی

پیغەمبەر ﷺ بەو خەڵکە)بڵێ :ئایا هەواڵی چاکتر لەو ناز و نیعمەتانەتان پێ رابگەیەنم ؟! (ئەویش ئەمەیە کە):بۆ ئەوانەی پارێزکار و خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەکانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان کە: چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا و بەبەردەوام کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لە گەڵ ژیانی نەبڕاوە لە گەڵ هاوسەرانی پاکیزەدا و بەدەم هەست کردنی بەردەوام بەڕەزامەندیی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خوایە بینایە بە بەندەکانی . ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، دە لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە . (جا ئەو ئیماندارانە، ئەمە سیفەتیانە)خۆگر و ئارامگرن (لە بەرامبەر ناسۆر ونا خۆشیەکانی ژیانەوە)، راستگۆو خواپەرستین،ماڵ وسامان دەبەخشن و، لە بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون (لە پەروەردگاریان دەکەن چونکە واهەست دەکەن کە وەك پێویست خواپەرستیان نەکردووە) . ئەمانە هەموویان چەند کردارێکن، کە ووزەکان بە جۆرێك وەگەڕدەخەن، کە دەروون پڕ بکەن، تا شوێنی بەتاڵی تێدا نەمێنێتەوە، کە پێویست بەوە بکات بە شتی پڕوپووچ پڕ بکرێتەوە، یاخود خواستی هەڵاتن بۆ جیهانی خەیاڵ لای مرۆڤ درووست بکات!

لەهەمان کاتدا ئیسلام هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی ژیانی زەوی –سەرەڕای ئەو ناخۆشیانەی تێیدان-پڕ بکات لە هیوا، هیوا بە خوا ﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ﴾ التغابن: ١١. واتە: ئەوەی باوەڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی رێنموویی دەکات بۆ لای خۆی. ئەوەی باوەڕی تەواو بێنێت، خوا دڵی

ڕێنموونی دەکات بۆلای خۆی.، هیوا بە ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژی دواییەی، کە ڕازی بوونی خوای لێیە، ئەو بەهەشتەی کە نەهیچ چاوێك بینیویەتی، نەهیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە بەسەر دڵی هیچ کەسدا هاتووە، هەروەها دڵی مرۆڤ بە زیکری خوا سەرقاڵ دەکات:﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨. واتە:ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو، دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگادار بن، دڵەکان هەر بە قورئان و یادی خوا خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە.

لەم بارودۆخەدا مرۆڤ لە واقیع ڕاناکات، پەنا ناباتە بەر بێهۆشکەرێك، کە هۆشی ببات، بەڵکو بە تەواوی بیروهۆشی لە واقیعدا ژیان بەسەردەبات، دڵی پەیوەست دەکا بە خوا و، هەوڵ بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو دەدات.

****

پێشتر چەند نموونەیەکی تاوانە هەرە بلاوەکانی کۆمەڵگەمان خستنەڕو و، هەڵوێستی ڕێبازی خوایشمان لە بەرانبەردا خستەڕوو و، ئەوەمان ڕوونکردەوە، کە ئاراستەو مەبەستی یەکەمی ئیسلام سزادان نیە، بەڵکو پاراستنی کۆمەڵگەیە لە تاوان[1].

پەروەردگار چاك دەزانێت کەسی واهەن، لێپێچینەوەو، ڕێگرتن لە تاوان لەگەڵیان سوودی نیە، هەر لە کوڕەکەی ئادەمەوە(علیە السلام)، کە

---

[1]) بڕوانە کتێبی (التشریع الجنائی فی الاسلام). نوسینی مامۆستا عبدالقادر عۆدە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

براکەی خۆی بە ستەم کوشت، تا ڕۆژی دوایی:﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْءَاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ المائدة: ٢٧ - ٣٠. واتە: بەسەرهات و هەواڵی دووکوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەوە، کە بەڕاستی ڕوویداوە، ئەوە بوو کاتێک هەردووکیان قوربانییان کرد، لە یەکێکیان وەرگیرا (کە لە سەر حەق بوو، لە خوا ترس بوو)، بەلاَم لەوی تریان وەرناگیرا (چونکە ڕق و ئەستوور و حەسوود و خوانەناس بوو) بەبراکەی وت: هەر دەتکوژم ئەویش لە وەلاَمی هەڕەشەکەیدا ووتی:خوای گەورە تەنها لە پاریزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت . سوێند بە خوا، ئەگەر تۆ دەست درێژ بکەیت بۆ من بۆ ئەوەی بمکوژیت، من دەستدرێژ ناکەم بۆ تۆبۆ ئەوەی بتکوژم، چونکە بەڕاستی من لەسزاو تۆڵەی خوا، پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم. (من بەو دەست درێژ نەکردنەم) بەڕاستی دەمەوێت بەگوناهی من و گوناهی خۆیشتەوە بگەڕێیتەوە، ئەو جا دەبێتە نیشتەجێی ناو ئاگر، هەر ئەوەش پاداشتی ستەمکاران. (سەرەنجام نەفسی سەرکەشی هانیداو کوشتی براکەی لاسادە و ئاسان کرد و کوشتنی، ئیتر خۆی خستە ریزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

لەبەر ئەم جۆرە کەسانەی کە هەموو هۆکارەکان ناتوانن ویستی خراپەکاریان تێدا بگۆڕن، ئەو سزایانەی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون بەم شێوەیە توندوتیژن﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ المائدة: ٣٨. واتە: دەستی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن، لە پاداشتی کاری ناڕەوایاندا، ئەمەش تۆڵەیەکە لەلایەن خواوە، خوا بالادەست و دانایە. ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ النور: ٢. واتە:سەدقامچی لە هەر یەك لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بەڕۆژی دوایی هێناوە، بادەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن. ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ المائدة: ٣٣ - ٣٤. واتە: بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەجەنگێن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاو کردنەوەی فەساد و بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە:(ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کە خەڵکیان کوشتووە و

جەردەییشان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەرکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەو سزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لە دونیادا، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆ هەیە. جگە لەوانەیان، کە تەوبەیان کردووە، پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ، ئەوە بزانن خوا لێخۆشبوو ومیهرەبانە (ئەڵبەتە ئەگەر ماڧ خەڵکیان بەسەرەوە نەبێت) .

هەروەها پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، فەرموویەتی:لا يحل دم امرئ مسلم يشهد ألا اله الا الله وأني رسول الله، الا في احدى ثلاث:النفس بالنفس، والثيب الزاني، والمارق من الدين، التارك للجماعة)رواه البخاري. واتە:خوێنی کەسێکی موسوڵمانحەلاڵ نابێت، کە شایەتی دەدات هیچ کەسێك جگە لە(الله)شایانی پەرستن نیە و من پێغەمبەری خوام، تەنها لەسێ بارودۆخدانەبێت:کوشتنەوەی کەسێك لەبری کەسێك، هاوسەرداری زیناکەر، هەڵگەڕاوە لە ئایین و، ئەو کەسەی لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا دەبێتەوە.

ئەم کەسانە و هاوشێوەیان، عوزریان نیە، کە تاوان دەکەن، (ئەگەرنا سزاکان بە(شبهات)لادەدرێن، هەروەکو باسمان کرد) ئەم جۆرە کەسان بۆیە ئەو سزا توندەیان بۆ دانراوە لەلایەن پەروەردگارەوە، تا توندی سزاکە، لە تاوانەکە بیانگێڕێتەوە، بەم جۆرە توندی و گەورەیی سزایە سوودی بۆ کۆمەڵگە هەیە، چونکە لەتاوانێك پاراستی، کە ئەگەر توندی سزاکە نەبوایە تووشی دەهات، ئینجا ئەگەر پاڵنەری تاوانەکە ئەوەندە بەهێز بوو، کە تووندی سزاکە کاریگەری نەبوو لە گێڕانەوەی، ئەوا سزادان هەر

پێویستە بۆ پاراستنی کۆمەڵگە، جالە هەردوو باراندا بەری تاوانکردن زۆر تەسك دەبێتەوە.

لەبەشی پێشووتردا باسی ئەوەمان کرد، کە کۆمەڵگەی ئیسلامی- سەرەڕای ئەم هەموو لارێ بوونە-ماوەی چەند سەدەیەك لە هەموو کۆمەڵگاکانی تری مرۆڤایەتی کەم تاوان تر بوو و، کەمتر کەوتبووە نێو خراپەکاریەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی ڕێبازی خوایی.. هەتا دواتر خەڵکی لە ڕێبازی خوایی دوورکەوتنەوەو﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ الروم: ٤١. واتە: تاوان و خراپە دەرکەوتووە و هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە . بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە، کە خەڵکی دەستیان داوەتێ، سەرئەنجام دەبێت تاڵاوی هەندێك لەکردەوەکانیان بچێژن (کە بەرپابوونی جەنگ و کارەساتەسروشتیەکانە) بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاکی و خواناسی .

# ئا ئەمەیە ئیسلام !

ئا ئەمەیـە ئیسلام بـەو جۆرەی، کـە خـوا ناردوویەتیـە خـوارێ و بـەو شێوەیەی، کە سەردەمێك لەسەر زەویدا پەیڕەو دەکرا، ئەو ئیسلامەیە، کە تەحـەددای هـەموو ئـەو سیسـتەمانەی پێدەکـەین، کـە مرۆڤایـەتی لـە مێژووە دوور و درێژەکەی ناسیویەتی.

ئێمە زۆر چاك دەزانین، کە ئیسلام-وەکو پێشوو-ئـەمڕۆ لەسـەر زەویـدا نیە، هـەروەها بـاش دەزانـین، کـە ئیسـلام بـە شێوە نموونـەییەکەی تـەنها ماوەیەکی دیـاریکراو لەسـەرەتای دەرکـەوتنی لەسـەر زەویـدا ژیـاوە، بـەڵام چەند ڕاستییەکی مێژوویی هەن، کە لە خەڵکی تێکەڵ بوەو پێویستی بە ڕونکردنەوە هەیە.

نموونەیی ئەو سەردەمە، لەبەرئەوە نەبوو کە نەوەی یەکـەمی ئیسـلام، بەتەواوی ئیسلامیان پـەیڕەو کـردووە، چـونکە ئـەم کـارە بـەبێ هـەڵاوێر، لەسەر هەموو نەوەکانی ئوممـەت پێویست کـراوە، چ بەتـەواوی پـەیڕەوی بکـات، یـان بـە کـەم و کوڕییـەوە﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾ النسـاء: ٦٤. واتـە: هـیچ فرسـتادەیەکمان نـەناردوە مەگـەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بەفرمانی خوا.

نموونەیی ماوەی یەکەم لەوەوە دروستبوە، کە موسوڵمانانی ئـەو کاتـە بەتەنها بە ئەنجامدانی فەرزەکان نەدەوەستان، بەڵکو کاری خۆبەخشانەی زیادەیـان دەکـرد-بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خـوا-بـەوەی، کـە هـەوڵی

ئەنجامدانی کارە سوننەتەکانیان دەدا، هەروەکو کە لەسەریان پێویست کرابێت، ئا بەم شێوەیە بۆ ئەم ئاسۆیە بەرز بوونەوە، کە هەرگیز لە مێژوودا دووبارە نەبوونەتەوە.

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، چەند نمونەیەك دێنینەوە .

هاوکاری و یارمەتیدان لە ئیسلامدا فەرزە، بەلاَم ئەو کارەی کە ئەو موسوڵمانە بەڕێزە کردی، کاتێك کە میوانێکی هات و، لەچەند دەنکە خورمایەك زیاتر هیچی تری شك نەدەبرد، بەلاَم لەبەردەم میوانەکەیدا داینان و، خۆی و هاوسەرەکەی واڕێك کەوتن، کە وا نیشان بدەن ئەوانیش لەگەڵی دەخۆن، لەکاتێکدا، کە تەنها بەبەتاڵی دەستیان دەبرد و دەهێنا، تا خواردنەکە هەمووی بۆ میوانەکە بێت.. ئەم کارە چاکەی کردیان لەسەریان فەرز نەکرابوو، هەرلەبەر ئەوە پەروەردگار ئایەتی لەسەر دابەزاندن، کە تا ڕۆژی قیامەت هەر دەخوێنرێتەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ الحشر: ٩. واتە: ئەوانەی پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان بەئیمان ڕازاندەوە، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە ( لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە )، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر

خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی رەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

مافی هەژاران لە پارەی زەکاتدا جێگیر کراوە:﴿ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ المعارج: ٢٤ - ٢٥. واتە: هەروەها ئەوانەی بەشێکی دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە ( بۆ جیهاد و تێکۆشان ). بۆ هەژاری داواکار و بێ ئەوای داوانەکەر .

بەڵام ئەو پیاوە هەژارەی، کە بە هاوسەرەکەی گووت موحەممەد(ﷺ) سامان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکات، ئایا ئێمەش داوای لێنەکەین، کە بمانداتێ؟ئەمیش پێی گووت:سکاڵای خوا دەبەیە لای پێغەمبەر(ﷺ)؟! ئەمیش ئارامی گرت و هاوسەرەکەیشی لەگەڵی ئارامی گرت، ئەم دوانە لە سنووری ئەو شتانەی، کە خوا لەسەریانی واجب کردبو کاریان نەدەکرد، بەڵام خۆبەخشانە کاری چاکەیان دەکرد، بۆئەوەی تا ئەو ئاستە بەرز ببنەوەو، ڕەزامەندی خوا بەدەستبێنن:﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ البقرة: ٢٠٧. واتە: هەندێ خەڵکیش هەن ( بە پێچەوانەی ئەوانەی باسکران ) خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، خوای گەورەش بە سۆز و میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانە. داواکردنی دوعا لە پێغەمبەر(ﷺ) لەوکاتەی، کە هەر لە ژیاندا مابوو، ڕەوشت و ئاکارێکی ئیسلامی بوو. بەڵام ئەو ئافرەتەی کە تووشی ڨ(صرع)دەبوو و، لەکاتی (ڨ)گرتنەکەیدا لەشی بەدەردەکەوت، بۆیە داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، کە دوعای شیفای بۆ لە خوا بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو، ئەگەر

دەتەوێ دوعات بۆ دەکەم، ئەگەر دەشتەوێ ئارام بگرە، تا بەهەشتت پێبدرێت. ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئارام دەگرم، بەلام تەنها دوعای ئەوەم بۆ بکە کە لاشەم دەرنەکەوێ. ئەویش(ﷺ)، دوعای بۆ کرد و، ئیتر دوای ئەوە لەشی دەرنەکەوت. ئەو ئافرەتە بەرێزە لەو ئاستەدا نەدەژیا، کە خوا لەسەری فەرز کردبوو، بەلام بەرز بوونەوەی بۆ ئاسۆ بەرزەکان هەڵبژارد، تەنها بۆ ڕازیکردنی پەروەردگار، ئیتر لەسەر نەخۆشیەکەی ئارامی گرت و، لەبەرانبەردا بەهەشتی وەدەستهێنا و، هەموو خۆشیەکانی دونیای بە بەراوورد لەگەڵ ئاخیرەتدا بەکەم زانی.

سەدان و هەزاران نموونەی لەم جۆرە، لەو سەردەمە نموونەییەدا هەبوون، کە گەیاندی بەم پلە بەرزە نموونەییە.

ئێمە بەو نموونانە هیچ شت لەسەر هیچ کەس پێویست ناکەین- هەرچەندە کە ڕاستییەکی مێژووییە-چونکە ئەوانە نموونەی چەند کارێکی چاکن، کە خوا فەرزی نەکردوون، ئەگەرچی لەلاشی خۆشەویستن، بەلام هیچ کەس لەسەر نەگەیشتن بەو ئاسۆیە سزا نادات، بەڵکو تەنها پاداشتی چەند بەرانبەر بەو کەسانە دەبەخشێت، کە توانای گەیشتن بەم ئاستە بەرزەیان هەیە. موسوڵمانی ئاسایی ئەگەر ئەو کارانە ئەنجام بدات، ئەوا پاداشتی خۆی لە چوونەبەهەشت و تام و چێژ وەرگرتن وەردەگرێت.

ئیسلام-بە شێوە ئاساییەکەیەتی-کە ئوممەت لەسەری موحاسەبە دەکرێت، جا ئەگەر بەباشی پەیڕەوی بکات، ئەوا پاداشت وەردەگرێت، ئەگەر لێشی لابدات، لەسەری سزا دەدرێت.

هەر ئەو ئیسلامە ئاساییە بوو، کە چەند سەدەیەك لەسەر زەویدا بەردەوام بوو، سەرەڕای ئەو هەموو لارێییەی، کە موسوڵمانان لە هەندێ

لایەنـدا تێـی کـەوتبوون، کـە ئێمـە تکـای گەڕانـەوەی دەکـەین، تـا توانـا و متمانـــەو جێنشـــینێتی زەوی بـــۆ بگەڕێتـــەوە، هـــەروەکو پـــەروەردگار لەبارەیـــەوە فەرموویـــەتی: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ النور: ٥٥. واتە: خـوا بەڵێنی دڵنیا بەخش و تەواوی داوە بەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە لـە ئێـوە و کـارو کـردەوە چـاکەکانیان ئەنجامـداوە بەڕاسـتی لـە ئایندەیـەکی نزیکـدا جێنیشین و پایەداریان دەکـات لەوڵاتـدا هـەروەك چـۆن ئیمانـدارانی پـێش ئەمانی جێنیشن کردووە و ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت، کە خـوا خۆی پێی ڕازیە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بەتەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هـیچ جـۆرە هـاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نـادەن، ئەوسـا ئـەوەی دوای ئـەو پایەداریـە بێبـاوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبارو لە سنوور دەرچووون .

ئەوەی ئێمە دەمانەوێ لەم نەوە تاقانە چاوی لێبکەین، هەر ئەوە نییە، کە سەرەڕای فەرزەکان چاکەی خۆبەخشانەی دی دەکەن، هەرچەندە هـیچ نەوەیەکی موسوڵمانان لـەم تاکانـەی، کـە گەیشتونەتە ئـەم ئاسـتە بـەرزە بەدور نـەبوە، بەڵام ئێمە چاو لە پابەند بونیـان دەکـەین بـەوەی، کە خـوا لەسەری فەرز کردون، چونکە لەسەر هەموو نەوەکان پێویست کراوە، نەك تەنها لەسەر نەوەی یەکەم، ئائەمەیە کەئێمە بانگەوازی بۆ دەکـەین و، بـە درێـژایی مێـژوو تەحـەددای هـەموو بەرنامـەکانی مرۆڤـی پێدەکـەین، چ

لەلایـەنی دادگـەری سیاسـی ئـابوری، یـان دادگـەری کۆمەڵایـەتی، یـان پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز، یاخوود ئەوەی، کە پەیوەنـدی بـەتاوان و سـزاوە هەیـە، چـونکە ئەمانـە هـەموویان فـەڕزن، کـە خـوا لەئاییـنەکـەی خۆیـدا پێویستی کـردوون و، ئـەمری بەجێبـەجێ کـردن و بـەرپاکردنیان کردووە لەسەر زەویدا.

****

بابگەڕێینـەوە سـەر خسـتنە ڕووی ئـەو هۆکارانـەی، کـە بوونەتـە هـۆی لادانی ئوممـەت لەسـەر ڕێگـای ڕاسـت و، هەڵکەنـدنی ئیسلام لـە دەروونـی موسوڵمانان، لەو شێوازەی کە هـەموو لایەنـەکانی ژیـانی لـەخۆدەگرت، بـۆ ئـەو شـێوازەی کـە ئێسـتا لەزۆربـەی وڵاتـە ئیسلامیەکاندا بڵاوە، ئێمـە دەگەڕێینەوە سـەری بۆئـەوە نییـە، کـە بیانووبێننـەوە بـۆ ئـەو بارودۆخـە خراپەی، کە ئوممەت تێی کـەوتووە، بـەڵکو بـۆ لێکدانـەوەو خسـتنە ڕووی ئەو ڕاستییەیە، لێکۆڵینەوەش جیـاوازە لـە پاسـاو هێنانـەوە. چونکە هـیچ شتێك ناتوانێت ببێتە پاساو بـۆ ئوممـەت، کـە لـەو ڕێیـە لابـدات، کـە خـوا بۆی داناوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، کە پێوەی پەیوەست بـووە، توانـاو دەسـەڵاتی پێ بەخشیوە، هەروەها هەر خـۆی ئوممـەت بەرپرسـە لـە بەرانبـەر خـوادا لەسەر هەر لاڕێ بوونێك، کە تێی کـەوتووە﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾ القیامـة: ١٤ - ١٥. واتـە: بـەڵکو ئینسـان خـۆی شـایەتە بەسەر خۆیەوە، ئەندامەکان شایەتن بەسەریەوە ) . هەرچەندە چەندەها پاکانـە بکـات و بیـانوو بهێنێتـەوە ( بـێ سـوود و بـێ کەڵکـە ) . یەکەمشەکشەی ئوممەت لە بەرانبەر ئەو ئەرکانەی، کە خوای پەروەردگار

لەسەری پێویست کردبوون، ئەو کاتە بوو، کە چاودێری کاروباری فەرمانڕەواو دەسەلاَتداران نەکرد،، بەو جۆرەی، کە پێشتر لەسەردەمی خەلیفەکاندا دەیکرد.

قسەوباسی زۆر دەکرێن دەربارەی ئەو فیتنەیەی، کەلە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان(ڕەزای خوای لەسەر بێت)ڕوویداو ئەو ڕوداوانەی، کە بەدوایدا هاتن و، ئوممەتی لەهەندێ لەو کارانە کردبو، کە لەسەری پێویست کرابوون، بووە هۆی دەرکەوتنی چەند توندو تیژییەك لەسەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی ئەمەویدا، کە لێرەدا باسییان ناکەین، بەڵام دەڵێین ئەو بزووتنەوە چاکسازییەی، کە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز(ڕەزای خوای لەسەر بێت)دروستی کرد، توانای گێڕانەوەی ئوممەتی هەبوو بۆ دۆخە سروشتییەکەی خۆی، کە پەروەردگار بۆی دانابو و، ئیسلام بەو جۆرە جێ بەجێ بکات، کە لەسەردەمی چوار خەلیفەکاندا جێبەجێ دەکرا، بەڵام ئەم کارە بەوجۆرەی کە پێویست بوو ئەنجام نەدرا، بەهۆی ئەو ستەمە سیاسییەی، کە شانبەشانی ئوممەت دەڕۆیشت تەنها لەچەند کاتێکی کەمدا نەبێت، کاتێك پیاوێکی چاك کاری مسوڵمانانی گرتە دەست، کە خۆی چاك بوو، نەك ئوممەت پابەندی کردبێت چاك بێت (هەرچەندە بەگشتی کارەکە بەو جۆرە خراپ نەبوو، بەو وێنەیەی کە ڕۆژهەڵات ناسەکان لە کتێبەکانیادا خستویانەتە ڕوو بەهۆی ڕق و کینەیەك، کە لەدەروونیاندا هەیانەو، دەیانەوێ موسوڵمانان لەمێژوویان دور بخەنەوە و، واز لە ئیسلام بێنن).

**پاشان لەڕێ لادان یەك بەدوای یەك داهات..**

بیری(ارجائی)دەرکەوت، کە ککردەوە لە چوارچێوەی ئیمان وەدەردەنێت و، دەڵێت ئیمان واتە بەڕاست دانان، یان بەڕاست دانان و دان نانە و، کارکردن لە چوارچێوەی ئیمان دا نیەو، دەڵێت:هەرکەسێك بڵێت(لا اله الا الله)، بڕواداره، هەتا ئەگەر هیچ لە درووشمەکانی ئیسلام ئەنجام نەدات.

هەروەها بیری(سۆفیگەری)دەرکەوت، کە گرنگی تەنها بەلایەنی پەرستن(درووشمەکانی خواپەرستی) دەدەن و، لەگۆشەیەك گۆشەگیر دەبن و، ئەمر کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە پشت گوێ دەخەن و دەڵێن: خەڵك بۆ خوای بەدیهێنەر (الخالق)لێگەڕێ!ئەگەر خوا بیەوێ هیدایەتیان دەدات[1]!!

هەروەها خۆشگوزەرانی بە هیلاکەتبەر لە کۆشکی دەوڵەمەندان و دەسەڵاتداراندا دەرکەوت و، لە بەرانبەریشدا هەژاری لەلای هەندێ کەسی کۆمەڵگە، کە نابێ هەژار بن.

ئیتر بەرە بەرە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم ئایینە پشت گوێ خران و بوونە کاری تاکەکەسی، کە هەرکەسێ بۆخۆی بەتەنها پێی هەڵبستێ، بەمەش ئەو پەیوەندییەی، کە ئوممەتی بەیەکەوە دەبەستەوە بەرەو کزی

---

[1]) ئەم وەسفە هەموو کۆمەڵە سۆفیگەرییەکان ناگرێتەوە، چونکە هەندێ کۆمەڵی وایان هەبوون، کە بەشداریان لە جیهاد و بڵاوکردنەوەی زانست و پەروەردەی باوەڕداری ڕاست و دروست و بانگەوازخوازی کردووە، ئەم جۆرە کەسانە سۆفی نەبوون، بەڵکو ئەمانە زاهید بوون و بەرگی سۆفیگەرییان پۆشیبوو!

و لاوازی چو، کە لە ڕاستیدا شادەماری ئـەم دینەیـە و، سەرچاوەی هێـزی ئوممەتە لە خۆشی و ناخۆشیدا.

هەروەها کاری فێرکردن و گەڕان بە زەویدا پشت گوێ خـران و، پشت بـە (خـۆ) بەسـتن شـوێنی پشـت بـە (خـوا)و، گرتنەبـەری هۆکارەکـانی گرتەوە.. ئیتر نەزانی و دواکەوتوویی هەموو لایەکی گرتەوە!

دیـارە ئـەم کارانـە هـەموویان بەیەکـەوەو، بەیـەکجار ڕوویـان نـەداوە، چـونکە ئێمـە لێـرەدا ڕووداوەکـانی نزیکـەی بیسـت سـەدەمان لەچـەند دێڕێکدا کورت کردۆتەوە!!

سەرەڕای ئەم هـەموو لاڕێ بوونـە، کۆمەڵگـەی ئیسلامی پارێزگـاری لـە زۆر لە ڕەووشت و بـەها بـەرزەکانی کـردووە و، -ماوەی چـەند سـەدەیەك- لەسەر دوو بەربەستی گەورە وەستابوو: کـە نوێـژ کـردن و حـوکم کردنـی شەرعی خوایە. چونکە موسوڵمان-لەدیدەنی کۆمەڵگەدا- دەبـێ نوێـژ بکـات و حوکم بە شەرعی خوا دەکات... هەتا ئـەو کاتـەی دوژمنـان هـاتن و ئـەو ئیسلامەی لای خەڵك مابوو، ڕوخاندیان، یاخود بەلایەنی کەمـەوە هـەوڵی ڕوخانیان دا!!

****

## لێرەدا ڕۆڵی هۆکارە دەرەکییەکان دێ

کاتێـك دوژمنــان ئــەو بارودۆخــەیان دیــت، کــە ئوممــەت لەهــەموو لایەنەکاندا تێی کەوتبوو، زانیان کە هـەلیان بـۆ ڕەخساوە، تـا بەیـەکجاری ئیسلام لەناو ببەن، بۆیـە لەهـەموو لایـەك هـەڵیان کوتایـە سـەر. بەمـەش

ئـەوەی کـە پێغەمبـەر(ﷺ) پـێش چـوارده سـەده ئوممەتەکـەی لـێ ئاگادارکردبووەوە هاتەدی، کە دەفەرموێ: ((یوشك ان یتداعی علیکم الامم کما تـداعی الأکلـة علـی قصـتها. قـالوا:أمـن قلـة نحـن یومئـذ یـا رسـول الله؟قـال:بـل أنـتم یومئـذ کـثیر، ولکـنکم غثـاء کغثـاء السـیل، ولینـزعنّ الله المهابة من صدور أعدائکم، ولیقذفنّ في قلوبکم الـوهن. قـالوا ومـا الـوهن یـا رسول الله؟قال:حبّ الدّنیا وکراهیة الموت))رواه أحمد و أبو داود.

واتە:نزیکە ئوممەتەکان هێرش بکەنە سەرتان، هـەروەك چۆن هێـرش دەکرێتە سەر قاپـە خـواردن، بـۆ ئـەوەی خواردنەکە بخۆن، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەمڕۆژە، کـە هێـرش دەکرێتـە سـەرمان لەبـەر ئەومیـە ئێمـە کەمین؟پێغەمبـەر فـەرموی: نـا، ئێـوە زۆرن، بـەلاّم وەك پـوش و پەلاّشی لافاون، ئەو کاتە خـوا تـرس و سـامی ئێـوە لـە دڵـی دوژمنـەکانتان هەڵدەکـەنێ و، وەهـن دەخاتـە دڵتانـەوە. گوتیـان:ئـەی پێغەمبـەری خـوا (وەهن) چییە؟ فەرموی: خۆشویستنی دونیاو حەزنەکردن بە مردن.

بێگومان لە دوژمنان چاوەڕوان نەدەکرا-کاتێك کە دەیان بینی ئوممـەت دەنویّ و، واز لە ئـەرك و داواکانی ئایینەکـەی دێنـێ و، بێهێـز و بـێ توانـا دەبێت-کە ڕێگا نەدەن زیاتر بێهێز بێت و یارمەتی بدەن تا هەڵسێتەوە!

بەلاّم پێویستە پـێش ئـەوە بـزانین، کە بۆچـی ئـەوان دوژمنن؟یاخود بزانین ئەوان دوژمنی چین؟

بـە دڵنیاییـەوە ئـەوان دوژمنـی ئیسـلامن.. لەبەرئـەوە دوژمنـی ئیسـلامن، چـونکە (ئیسلام)ە!هـەروەها دوژمنـی موسوڵمانانیشـن چـونکە (موسوڵمانن)! ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾ البقـرة:

١٢٠. واتـە: هـەرگیز جولەکـە و گاورەکـان لـە تـۆ ( ئـەی محمـد ﷺ، ئـەی ئیمانــدار ) ڕازی نــابن، هــەتا بەتــەواوی شــوێن ئــاین و بەنامەکــەیان نەکــەویت. ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا﴾ البقـرة: ٢١٧. واتــە: ( بێگومـان بـێ بـاوەڕان ) بـەردەوام دژتـان دەجـەنگن، هەتا واتان لێبکەن لە دین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت.

ئەوانــەی کـەـلـە سـادەییان‌ـوا بـیر دەکەنــەوە، کـە ئــەو جەنگـەی دژی ئیسلام دەکرێ، هۆکارەکەی ڕووداوەکانی ( ١١ی سێپتێمبەری سالّی ٢٠٠١)ە، پێویسـتـە بگەڕێنــەوە بـۆ مێـژوو. چـونکە کاتێـك فێردیناند زوڵمـی لـە موسوڵمانانی ئەندەلوس کرد، دوای ئەوەی کە بەڵێنی پاراستنی پێدابوون و، لە سەدەی پازدەهەمی زایینی دەیان هەزار کەسی کوشت، خۆ ئەو کاتە ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر ڕوویـان نـەدابوو!هـەروەها ئەوکاتـەی دوایـین دەوڵەتۆچکەی ئیسلامی لە ئەنـدەلووس‌ـکە غەرناتـە‌ـبـوو، لـە سـالّی ١٤٩٢ز ڕوخاو، پاپا زەوی و زاری موسوڵمانانی‌ـکە بـە زەوی و زاری کـافران نـاوی نابوو‌ـلە نێوان ئیسپانیا و پورتوگالدا[٢] دابەشکرد، پێی گوتن، کە بـە تـەنها وەدەرنانیان لە ئەندەلوس بەس نیە، بەڵکو لەدەرەوەش بەدوایان کەون، تا لـەناویان دەبـەن. خـۆ ئــەو کاتــە ڕووداوەکـانی ١١ی سـێپتێمبەر ڕوویـان نەدابوو!هەروەها کاتێـك ڤاسکۆ دێگامـا بـەدەنگ بانگـەوازی پاپاوەچـوو و، چـووە دەرەوە و وولاّتــە ئیسـلامیەکان گــەڕا، تــا گەیشــتە دوورگــەکانی ڕۆژهەلاّتی هیندـبە هاوکـاری دەریـاوانی موسوڵمان ئـیبن ماجـە(!)ـپاشـان

---

[٢] ) پرتوگال.. زەوی(پرتەقاڵ)ی ئیسلامییە.. کە موسوڵمانان بـەهۆی زەوییـە پرتەقاڵـەکان ناویان لێنابوو.

گووتی:ئیتر ملی ئیسلاممان گرتووەو، تەنها ئەوە ماوە پەتەکە توند کەین و بخنکێت!خۆ لەم کاتەدا ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر ڕوویان نەدابوو!هەروەها کاتێك (ماجەلان)هەستا بەگەشتەکەی بۆ ڕۆژهەلاتی ئاسیا، تا وولاتی (فلیپین)ی موسوڵمان بخاتەوە پاڵ خاچپەرستی (پرسیشی بەپاپا کرد تارێگای پێبدات)، خۆ هێشتا ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر ڕوویان نەدابوو و، دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس بە ڕۆڵێکی شارستانی زۆر بەرز هەڵدەستا، تا خەڵکی ئەوروپا لە تاریکی سەدەکانی ناوەڕاستیان دەربێنن و بەرەو ڕووناکی ڕێنموونییان بکەن!!

هەروەها کاتێك(ئەللەنبی)ئینگلیزی، لەساڵی١٩١٧دەستی بەسەر قودسدا گرت، گووتی:ئێستا شەڕی خاچپەرستان کۆتایی هات[٢]. هەروەها کاتێك جەنەڕاڵ(گۆرۆ)ی فەرەنسی لە ساڵی١٩٢٠ز لەسەر گۆڕی(سەڵاحەددینی ئەییوبی)وەستا گووتی: سەلاحەددین وا گەڕاینەوە! ئێمە نەوەی خاچپەرستانین، جاهەر کەسێك حوکمی ئێمەی بەدڵە بابمێنێتەوە، هەر کەسێکیش حوکمی ئێمەی ناوێت باوڵات بەجێ بێڵێت، خۆ هێشتا ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر ڕوویان نەدابوو!

لەبەرئەوەی ئێمە لێرەدا باسەکەمان لەسەر هێرشی خاچپەرستان بۆسەر ئیسلام نییە، جائەو جەنگ و هێرشە سەربازی بێت، یان سیاسی، یان ئابوری، یان فیکری، بەڵکو ئێمە باسی دوو شت دەکەین: ڕونکردنەوەی ڕاستیی ئیسلام بەو شێوەیەی، کە خواناردوویەتییە خوارێ و،

---

[٢]) شەڕەکە تەواو نەبوو بوو، بەڵکو دەستەواژەکە ڕق و کینەی خاچپەرستان بەسەرکردایەتی(ئەللەنبی)دەردەخات)!

بەوشێوەیەی، کە لەسەرەتای ئیسلامدا پەیڕەو کرا، هەروەها دەرخستنی جووڵەی ئوممەت بەم ئایین و بەهەڵکشان و داکشان لەمێژوودا.

****

ئیسلام بەوشێوەیەی، کەخوا ناردوویەتییە خوارێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەسەر زەوی نیە، لەبەر ئەوە نا، کە جێبەجێکردنی لەتوانای مرۆڤدا نیە، چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیڕەو کراوە، چ بەو ئاستە نمونەییەی، کە لەڕۆژکاری خەلافەتدا پەیڕەو دەکرا، یاخود بەوشێوە ئاساییەی، کە چەند سەدەیەك بەردەوام بوو و، شارستانیەتێکی جیاوازو نمونەیی سودبەخشی لەجیهاندا درووست کرد، کە(لا الە الا اللە)بوو، ڕەگ وریشەکەی لق و پۆپەکەشی(هەمووچالاکیەکانی ژیان بوو.. هەروەها نا لەبەر ئەوەی، کە ڕۆژگار تێی پەڕاندووە و پێویستی پێ نەماوە، چونکە هیچ شتێك ناتوانێت بەرنامەی خوایی بۆ بەڕێوەبردنی ژیان دایبەزاندوە، تێ بپەڕێنێت و پێویستی پێ نەمێنێ، هەرلەسەرەتاکانی ناردنی پێغەمبەری پێشەوا(محمدﷺ)، تا ئەو کاتەی خوا زەوی و هەرچی لەسەریەتی بۆ خۆی دەباتەوە، دوای ئەوەی خوا ئایین و بەرنامەکەی تەواوکردو نیعمەتەکەی بەکۆتا هێنا، دوای ئەوەش کەپەیامەکان بەهاتنی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ)کۆتاییان پێهات : ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ المائدة: ٣ واتە:. ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن، ڕازیم بەوەی، کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین ئاینتان .

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٤٠ واتە: محمد باوکی هیچ کەس لە پیاوانی ئێوە نیە، بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێك زانایە .

بەڵام بۆ ئەو هۆکارانەی، کە پێشتر ئاماژەمان پێدان، چ ئەو لارێبوونەی تووشی ئوممەت بووە، یان ئەو هەوڵانەی کە دوژمنان دەیدەن بۆلەناوبردنی ئەم دینە، ئەو بارودۆخەی، کە فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله على وسلم) بەوپەڕی بەلاغەتەوە دەریدەخات(یوشك ان تتداعى عليكم الامم)ئەمەیە پیلانگێڕانی دوژمنان (ولكنكم غثاء كغثاءالسيل) ئەمەشە حاڵی ئوممەت لەناوەوەدا. هەردوو هۆکارەکە لەهەمان کاتدا بوونیان هەیە، بۆیە پێویست بەوە ناکات، کە نەرێ لە یەکێکیان بکەین، تا ئەوی تر بسەلمێنین. پێویست ناکات نەرێ لە پیلانگێڕان بکەین، تا حاڵی خراپی ئوممەت بسەلمێنین، هەروەکو(عەلمانیەکان دەیکەن)، هەروەها پێویستیمان بەوە نیە، کە تەنها لە پیلانگێڕان بڕوانین و حاڵی خراپی ئوممەت پەراوێز بکەین، هەروەکو هەندێ نووسەری ئیسلامی دەیکەن، بەڵکو پێویستە هەردووکیان پێکەوە باس بکەین و پێکەوە جەختیان لەسەر بکەینەوە، چونکە هەردووکیان پێکەوە واقیعی ئەمڕۆمان نیشان دەدەن.

****

ئـەم هۆکـاره هەرچـی بێـت، ئـەوه حـاڵی ئێسـتامانه، نـەوەك حـاڵی داهاتوومان!

## داهاتوو هەر بۆ ئیسلامە.

یەکـەم:چونکه پـەروەردگار بـەڵێنی داوه، کـه بەڵێنەکەیشی ناشـکێنێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾ الفتح: ٢٨ واته: خـوا ئـەو زاتەیـه کـه پێغەمبـەری خـۆی ڕەوانه کردووه، هاوڕێ لەگەڵ ڕێنموویی و پـەیامی ڕاسـت و درووسـت، بـۆ ئـەوەی زاڵـی بکـات بەسـەر هـەموو پـەیام و بەرنامەیـەکی تـردا، خـوا خۆیشی بەسه بۆ شایەتیدان و ئاشکرا کردنی ئـەو ڕاسـتییه . ﴿ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ الـروم: ٦. واتـه: بێگومـان ئەوه بـەڵێنی خـوا خۆیـەتی، خـوا بـەڵێنی خـۆی ناشـکێنێ، بـەڵام زۆربـەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت له دونیا دەزانن ( عـەقڵیان لـه چاویاندایه ) ئەوانـه بێ ئاگا و بێ خەبەرن له ڕۆژی دوایی و قیامـەت .... دووەم: بـەهۆی ئـەو ڕەگـەزه چاکسـازییانەی، کـه لەلایـەن خـوای کارزانـەوه بەبـەر ئیسـلامدا کـراون، ئـەو پـەروەردگارەی کـه مرۆڤـی درووسـت کـردووه و، هەرچـی خوتخوتەش، که لەدڵیدا درووست دەبێت دەزانێت چ چاکی دەکات و، چ بـۆی چـاکه، جـا چ لەلایـەنی دادگـەری سیاسـی بێـت، یـان ئـابووری، یـان کۆمەڵایەتی، یان پەیوەندی نێوان نێر و مێ، یان ئەوەی، که پەیوەندی به تاوان و سزاوه هەیه، که ئەمانـه چـەند بنچینەیەکن، ئەگـەر مرۆڤایـەتی

پەیڕەویان بکات، لە باشترین بارودۆخدا دەبێت و، هەرکاتێك لێیان دووربێت، توشی شپرزەیی و سەرلێ تێکچوون دەبێت!

سێیەم:چونکە ئوممەتی ئیسلام خەریکە بەخەبەر دێتەوەو، بەرەو ئیسلام دەگەڕێتەوە، ئێمە لەچەند کتێبێکدا گوتوومانە، کە گەڕانەوەی ئوممەت بۆ بارودۆخی سرووشتی خۆی، کە چەند سەردەمێك تێیدا ژیاوە، دوور نیە و، ئەوەی پێویستیەتی ئەوەیە، کە ئوممەت بەرەو ئەو ئایینە ڕاست و درووستە بێت، کە چەند سەدەیەك بەهۆیەوە ژیاوەو، چەند سەدەیەك لە نیعمەتەکانی ئەم دینە بەهرەمەند بوەو خوا بەهۆی ئەم ئایینەوە لەسەر زەویدا دەسەڵاتداری کرد.

ڕاستە ئەم ڕابونە هێشتا هەر لە سەرەتایدایە و، لەوانەیە ماوەیەکی پێبچێت، تا پشتێنەی ئوممەت ئەوەندە بەهێز بێت، کە بەشی هەڵسانەوە بکات.

بەلاَم ئەم دیاردەیە ڕوون و ئاشکرایەو، لە بیری زۆربەی دانیشتووانی زەوی دایە، چ دۆستان، چ دوژمنان. دۆستان هیوای گەشەکردنی زیاتر بۆ ڕابونەکە دەخوازن و دەیانەوێ زیاتر پێشبکەوێت، دوژمنانیش هەوڵی کوژاندنەوەی ئەم مەشخەڵە دەدەن و، دەیانەوێت لەناوی ببەن.

چوارەم: بەهۆی ئەو گەوجێتیانەی، کە دوژمنان دەیکەن.

گەورەترین گەوجێتی، کە ئێستا دوژمنان دەیکەن و، نیشانەیە لەسەر کەم و کوڕی هۆشیاری مێژووییان، گوشار خستنەسەر تەوژم و لایەنی بەرز و دیارکەوتوو، بەوهیوایەی لەناوی ببات!

ئەزموونی مێژوو-کە دوژمنان لێی بێ ئاگان، بەهۆی ئەو ڕق و کینەیەی، کە لەدژی ئیسلام لە دڵیاندایە-بۆمان دەردەخات، کە گوشار

خستنەسەر تەوژم و لایەنی بەرز و دەسەلاٌتدار، هەمیشە بە گەشەسەندنی ئەو تەوژم و لایەنەو، لەناوچوونی ئەو لایەنانەی دوژمنایەتی دەکەن و، نەمانی ناویان لە مێژوودا کۆتایی دێت[٤]!

هەروەها شوێنەواری خراپی ئەو گەوجێتیانەی دوژمنان دەیکەن، ئەوەیە، کە موسوڵمانان هۆشیارتر بوونەتەوەو، باشتر دەزانن ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر زەویدا دوژمنایەتی دەکرێت، ئیسلامە-لەژێر پەردەی جەنگی دژە ئیرهاب-کە یەکێك لە ئەنجامەکانی لادانی پەردەبوو لەسەرچاوی زۆر خەڵك، کە بەشارستانییەتی ڕۆژئاوا خەڵەتابوون و، گەڕانەوەیان بەرەو ئیسلام، یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی زیاد بوونی ژمارەی ئەو کەسانەی کە دێنە ناو ئیسلام، لە سەرانسەری جیهاندا!!

****

## داهاتوو هەر بۆ ئیسلامە.

ئەمە بەرپرسیاریەتیەکی گەورە دەخاتە سەرشانی موسوڵمانان، بەتایبەتیش ڕابونی ئیسلامی.

هەر ئوممەتێك لە ناخی خۆیدا هەست بە بەزین بکات، ئەمە وای

---

[٤] لەوانەیە ئەوە بەبیری خوێنەردا بێت، کە شیوعییەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان لایەنێکی بەرز و دەسەلاٌتدار بوو، کەچی لەم یاسایە بەدەرە، چونکە ڕۆژئاوا توانی لەناوی ببات و، خۆشی لەناو نەچێ. بەلاٌم لەڕاستیدا لێکترازان و هەڵوەشانی بنچینەکانی شیوعییەت، لەناوەخۆیدا بوو، لەسەرەتادا لەسەر دەستی (خرۆشۆف)و، پاشان لەسەر دەستی(بریجینیف)ی خاوەنی بزوتنەوەی(چاکسازی)، کە بە(بریسترۆیکان)ناسرابوو، لەکۆتایشدا لەسەر دەستی(یلتسن)، کۆتایی پێهات و شیوعییەت لەناوچوو.

لێدەکات کە هەوڵ نەدات دووبارە هەڵبستێتەوە.

کاتێك کە موسوڵمانان لە جەنگی ئوحود دا تێکشکان، بەهۆی بێ ئەمری کردن لە فەرمانی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ)، ئاراستەکردنی خوایی ئـــەوەبوو: ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٩. واتە: ( ئەی ئیمانداران ) کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن، ئەگەر ئیمانداری چاك ڕاست و دروست بن . مەرهەمی شیفا بەخشی زامەکانی ئەم تێکشکانەبوو، ئیتر دوای ئەوە دڵ و دەروونەکان کەوتنەوە جووڵەو، لەدوای دۆڕان و تێکشکان، سەرکەوتن و سەرفرازی هات: ﴿ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴾ آل عمران: ١٧٢ - ١٧٤. واتە: ئەوانەی، کە بەدەم بانگەوازی خوا پێغەمبەرەﷺ چوون، دوای ئەوەی کە تووشی ناخۆشی و زام و ئێش بوون، بۆ ئەوانەیان، کە چاکەیان کردو پارێزگار بوون، پاداشتی زۆر گەورە و بێ سنوور ئامادەیە . ئەوانەی، کە خەڵکی (ئیمان کز) پێیان دەڵێن : بەڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە، لێیان بترسن، ( خۆتان تووشی بەڵا مەکەن ) بەڵام ئەوان ( واتە ئیمانداران بەو پڕو پاگەندەیە ) باوەڕیان زیاترو دامەزراو،

وتیان : خوامان بەسە، کە یاریدەدەرو یارمەتیدەرێکی چاکە . ئەوسا ئیتر موسوڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و ناز و نیعمەتی خوایی دا، هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوون )، کە خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە .

هەر دەبێ هەستی بەزین و تێکشکان لە دڵەکان بێتە دەرەوە، تا دڵ و دەروونەکان ئامادەسازبن بۆ کارکردن. هەربۆیە لەسەر بانگخوازان پێویستە جەخت لەسەر ئەم خاڵە بکەنەوە:کە بەزین بەرانبەر دوژمن-بەهۆی هەر هۆکارێك بێت-مانای ئەوە نییە، کە دوژمنان لە ئیمانداران بەرزترن، بەڵکو ئیمانداران، بە ئیمانەکەیان، هەر خۆیان بەرز و بەڕێزن. بەڵام —بۆئەوەی بەم ئیمانە بەرز ببنەوە-لەسەریان پێویستە لەسەرەتادا، ڕاست و درووستی ئەم ئایینە بزانن، کە ئیمانیان پێی هەیە، پاشان لە واقیعدا جێبەجێی بکەن و مەبەستەکانی وەدی بێنن. ئەگەرنا ئیمان بەبێ زانینی ڕاستی ئەم دینە، هیچ شتێك لە واقیعدا ناگۆڕێت و، وەدیهێنانی مەبەستەکانی تەنها خەو و خەیاڵێکە! ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ النساء: ١٢٣. واتە: ( پاداشت و ڕێز و نرخ ) نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی خاوەن کتێبە، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات، ئەوە بەو هۆیەوە سزا دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت، جگە لە خوا پشتگیریی بکات و یارمەتی بدات. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾ الصف: ٢ - ٣. واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بۆچی شتێك دەڵێن و ئەنجامی نادەن ؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە ؟ئەوە لای خوا زۆر ناپەسەندە بەدەم شتێ بڵێن، کە بە کردەوە نەیکەن.

ئەمە تەنها ڕێگایە بۆ نەهێشتنی غوربەتی دووەم، کە تووشی ئیسلام بووە، هەر ئەمەش بوو، کە غوربەتی یەکەمی لادا:ئیمانێکی هۆشیار بە حەقیقەتی ئەم دینە و، پابەندبوون بە ئەمر و ئاراستەکانی و، بەجێهێنانی ئەو ئەرکانەی داوای دەکات، ئینجا سەرکەوتن لەلای خواوە دێت :﴿ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ﴾ الأنفال: ١٠ واتە : سەرکەوتن تەنها لەلایەن خواوەیە. لەسەر بانگخوازان پێویستە خەڵکی دڵنیا بکەنەوە، کە ئیسلام تاکە بەرنامەی نموونەییە، چونکە لەلای خواوەیە.

هەروەها پابەند بون پێی لە داخوازیەکانی (لا اله الا الله)و، بڕوا بوونە بەوەی، کە هەر ئیسلام داهاتووە [٥].

هەروەها دەبێ بانگخوازان ئەوەش بزانن، کە ئەو ڕێگایەی لەبەردەمیاندایە، بەگوڵ نەڕازاوەتەوە، بەڵکو گەشتێکی سەخت و دژوارەو، لەهەردوو لایدا دڕندەی ترسناك لەسەردا وەستاون، کە دەیانەوێ پەلاماری

---

[٥] جێی سەرنج ئەوەیە کە لە ڕاپۆرتی دامەزراوەی (ڕاند)ی ساڵی ٢٠٠٧ دادەردەکەوێ، کە ئەم دامەزراوەیە نەخشەی ئەمریکا بەرانبەر بە ئیسلام دەکێشێت، ئەو دەستەواژەیەیە کە دەڵێت:لەسەر ئەمریکا پێویستە دژایەتی ئەو کەسانە بکات، کە دەڵێن:ئیسلام نیزامی نموونەییە، هەوڵی لەناوبردنیان بدات!

هەرکەسێك بدەن، کە پێیدا تێپەڕێ.

نەفامییەتی یەکەم، نەفامییەتێکی سادەبوو، کە چەند بتێکی بەرهەستی بەرجەستە و، چەند نەریتێکی دەپەرست، کە خوا بڕیاری لەسەرنەداوە، سەرەڕای ئەوەش بەربەرەکانێی ڕێبازی ڕاست و درووستی خوایی دەکرد، تا ئەوکاتەی پەروەردگار سەرکەوتنی دینەکەی لە کۆتاییدا وەدیهێنا.

بەڵام هەرچی نەفامییەتی نوێیە، بەهێزترین و دڕندەترین نەفامییەتە، کە مێژوو ناسیبێتی، چونکە پشت ئەستوورە بە ئەندازەیەکی گەورەی زانست و زانیاری، کە پێشتر مرۆڤ پێی نەگەیشتبوو: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾ الروم: ٧. واتە: ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دونیادا بەدی دەکەن، لە بەرانبەر قیامەتیشدا بێئاگان.

هەروەها پشت بە فەلسەفەو بیروبۆچونێك دەبەستێت، کە ڕاست و هەڵە و، سوودبەخش و زیانبەخشی تێدا تێکەڵ بووە، بەڵام هەرهەموی هەڵە نییە، بۆیە شەڕەکە لەگەڵ ئەمدا ئەستەم تر و درێژخایەن تر دەبێت.. تا خوا بیەوێ.

هەروەها لەسەر بانگخوازان پێویستە، گوێ بەو قسە درۆیانە نەدەن، کە پێیان دەڵێن-تا لاڕێیان بکەن و سەریان لێ بشێوێنن-کەوا دیموکراسی چارەسەری ئامادەو شیاوی پێن بۆ چارەسەر کردنی کێشە سەردەمییەکان، بەڵام هەرچی ئیسلامە-تا بتوانێت لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بڕوات-پێویستی بە کۆشش و نوێکاری هەیە، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

گریمان دیموکراسی- هەمووی خێر و چاکەیە، کەواش نیە-خۆ ئامێرێك نیـە، کـە بتوانرێـت بکرڕێـت، یـان لـە شـوێنێك بهێنرێـت و، بـە تـەزووی کارەبـاوە بلکێنرێـت، ئـیتر لەخۆیـەوە مـافی خـەڵك بـدات، بۆیـان مسۆگەر بکات!بەڵکو کارەکە پێویستی بە پەروەردەکردنی خـەڵك هەیـە، تـا بتـوانن پارێزگاری لە مافەکانیان بکەن و ڕێ بـە هـیچ کـەس نـەدەن، دەسـتدرێژی بکاتە سەریان و، تێبکۆشـن بـۆ وەدەستهێنانی پێویستییەکانی ژیانیـان و، ڕێ بە هیچ کەس نەدەن یاری بە مافەکانیان بکەن. ئایا پەروەردەکردنیان لەسەر ئەم کارانـە، بـەو ئاسانییە دەکرێ، کـە بـە ووتارێـك، یـان کتێبێـك وەدی بێ؟!یاخودئەم کارە هەوڵدان و قوربانی دەوێـت و، کـارێکی قـوڕس و گرانە، تا خەڵك دەگەنە ئەم ئاستە؟!

بێگومـان دەسـەڵاتدارە ستەمکارەکان هـەرگیز بەخۆشـی خۆیـان واز لـە دەسەڵاتەکانیان ناهێنن، بە گەلەکانیان نـاڵێن:فـەرموون مافـەکانتان ببـەن و، لەسەر هەر گەورە و گچکەیەك لێپرسینەوەمان لەگـەڵ بکـەن و، ئەگـەر باش بووین لێپرسینەوەمان لەگەڵ بکەن ئەگەر خراپیش بووین ڕاستمان بکەنـەوە، هـەروەکو خەلیفـەکانی ڕاشـیدین دەیـانگووت (کـە گـەورە پیـاوە بەڕێزەکانن، دوای پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسـەربێت))، ئـەمیش بـۆ تەنها جارێك لـە مێـژووی مرۆڤایەتیـدا ڕویـدا، کاتێـك ئیمانیـان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی هێنـاو، ئیسلامیان وەکـو خـۆی لـە واقیعـدا جێبـەجێکرد ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ النساء: ٥٨. واتە: بێگومان خـوا فـەرمانتان پێـدەدات، کـە هـەموو ئەمانەتـەکان (سـپاردەکان)

بگەڕێننەوە دەست خاوەنەكانیان، هەر كاتێكیش داوەریتان كرد لەنێوان خەڵكیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بكەن، چونكە بەڕاستی خوا بەجوانی بە چاكی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێدەدات، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەر و بینایە .

ئیتر ئەگەر پەروەردەكردن و هەوڵ و ماندووبوون و پشوو درێژی لە كاردا بۆ هەردوو ڕێگاكە پێویست بێت:ئیسلام و دیموكراسی، كەسی ئیماندار بە خواو پێغەمبەرەكەی(ﷺ)، دەبێ كام ڕێگا بگرێتە بەر؟ ئەو ڕێگایەی كە حاكمیەتی شەرعی خوا ڕەتدەكاتەوەو، دەبێتە هۆی خێر و بەرەكەت لە دونیاداو، لە دواڕۆژیشدا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت:﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ الأعراف: ٩٦ - ٩٨. واتە: خۆ ئەگەر خەڵكی شارەكان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕو بەرەكەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەكردنەوە، بەڵام ئەوان كە پەیام و پێغمبەرانی ئێمەیان بەدرۆ زانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو كاروكردەوانەی دەیانكرد گرتمانن و لەناومان بردن.

﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ النساء: ١٣. واتە: ئەوانەی باسكران (دەربارەی هەتیوان و چۆنیەتی دابەشكردنی میراتی ) ئەو سنورانەن خوا دیاریكردوون، جا ئەو كەسەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەكەی بكات ( لەم بوارەداو لە

هەموو بوارەکانی تردا )، ئەوا خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە : کە چەندەها ڕووبار بە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازیی گەورە و دەستکەوتی بێ سنوور .

ئەو بەرنامەیەی، کە خوا ناردوویەتی و، ئەمری بە شوێنکەوتنی کردووە، ئیسلامە، نەك دیموکراسی، ئەوەش کە لێپرسینەوەمان لەسەر دەکات لە ڕۆژی دواییدا، ئیسلامە، نەك دیموکراسی، ئیتر ئایا هەڵبژاردنی جگە لە ئیسلام لەبەردەم کەسی ئیمانداردا هەیە؟! ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا﴾ الأحزاب: ٣٦. واتە: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەر پشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوە ئاشکرا، گومڕاو سەرلێشێواوە .

هەروەها دەبێ بانگخوازان لەبیریان بێت، ئەو ڕێگایەی پێویست بیگرنەبەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نەفامییەتی نوێ، ئەوا ڕێگاشیانە بۆ چوونە بەهەشت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ العنكبوت: ٦٩ واتە: ئەوانەش لە پێناوی ئێمەدا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی

چاك و دروستی خۆمان ( كە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە )، بێگومان خوای پەروەدگار هەمیشە لەگەڵ چاكەكارانە . ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ آل عمران: ١٤٢. واتە: یان وا گومانتان دەبرد ( هەروا بە ئاسانی ) دەچنە بەهەشتەوە ؟ كە هێشتا خوا ( لە جیهانی واقیعدا ) دەریشی نەخستووە كامتان هەوڵ و كۆشش و جیهادی كردووەو كامتان خۆڕاگرو ئارامگربووە...

هەروەها با ئەوەشیان لەبیربێت، كە ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی دەیدەن، بەرهەمەكەی بە پشتیوانی خوا –تەنها ڕزگاركردنی جیهان ئیسلامی نابێت، لەو زەلیلی دوواكەوتوویی و بێهێزی و كەم و كوورتییەی تووشی بووە، بەڵكو بەو زانست و زانیارییەیان ڕێگای ڕزگاربوون بۆ مرۆڤایەتی خۆش دەكەن و لەو گومڕایی و فەسادی و خراپەكارییەی تێی كەوتوونی، دەریان دێنێ، چونكە پەروەردگار، كۆتا پێغەمبەرەكەی(ﷺ) بۆ مرۆڤایەتی ناردووە، تا لە تاریكی ڕزگاریان بكات و بەرەو ڕووناكی ڕێنموونیان بكات:﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الأعراف: ١٥٨. واتە: (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵكینە بەڕاستی من پێغەمبەرو فروستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی، ئەو خوایەی كەهەر بۆ ئەوە خاوەنداریێتی ئاسمانەكان و زەوی .

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧. واتە: ئەی محمد(ﷺ) ئێوە تۆمان ڕوانە كردووە تەنها بۆ ئەوە كە ببیتە ڕەحمەت و بەرەكەت

بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیانداروو ڕووەك و پەری ... هتد).

هەروەها لە کۆتاییشدا با ئاگاداری فەرموودەی پیرۆزی خوابن: ﴿ وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَـٰلَكُم ﴾ محمد: ٣٨. واتە: جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم دین و بەرنامەیە، خوا کەسانی چاکتر لە ئێوە دەهێنێتە مەیدان، کە بەهیچ شێوەیەك لە ئێوە ناچن و وەك ئێوە نابن .

## ناوەرۆك